¤¤¤¤¤¤¤¤¤¤¤¤¤¤¤¤¤¤¤¤¤¤¤¤¤

ناوی کتێب: دنیای بێدەنگی

نووسینی: مەریوان قەرەداخی

بابەت: شیعر

هەڵەچن و پێداچوونەوە: سۆما سامان

دیزاین: کیکۆ دیزاین

تیراژ:١٠٠٠ دانە

ساڵی چاپ: ٢٠٢١

مۆتیڤ:عەبدولستار شارباژێڕی- پینتەرێست

چاپخانەی:کەمال

لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی (١٦٠٣ )ی ساڵی ٢٠٢١ی پێدراوە

********************************

# سوپاس وپێزانین

*زۆر سوپاس بۆ بەڕێز ( سەرکەوت زەکی ) ئەندامی سەرکردایەتی ( ی ن ک )،کە هاوکاری کردم تا ئەم پەرتووکە بەچاپ بگات.

* زۆر سوپاس بۆ خاتوو( ڕۆژ هەڵە بجەیی ) شاعیر، کە پێشەکی بۆ ئەم پەرتووکە نوسیوە.

* زۆر سوپاس بۆ مامۆستا ( ڕەوەند ساڵح ) لێدوان و لێکۆڵینەوەی کردووە لەسەر زمان و خاڵبەندی.

* زۆر سوپاس بۆ نوسەر( بەختیار مام حەمید ) تێڕوانین و بیرو هەڵسەنگاندنی فەلسەفی بەچەند پەیڤێك نەخشاندووە.

* زۆر سوپاس بۆ گرافیك دیزاینەر( سەرکەوت پێنجوێنی ).

## پێشەکی

شیعر بەرزترین ژانری ئەدەبییە،کەشتێك ئاستێكی بەرزی هەبێت...ئیتر بۆ هەمووان نییە،دەبێت لەوە تێبگەین شیعری ئەمڕۆ بەخوێنەر پێوانە ناکرێ ئەگەر وا بڵێین ئەمە جۆرێکە لەسنورداركردنی شیعر..شیعر كەشفكردنی پرسیارو نادیارەکانە.. داهێنان لەشیعرا ئەوەیە ،کەڕووکاری سادەو دڵنیاکەرەوە تێپەڕێنێت..شیعر ئەوە نییە بۆ بیروباوەڕ و چێژی خۆشی باو خۆی بخاتە ڕوو...
شیعر دەبێت وا لەخوێنەر بكات تووشی دڵەڕاوکێ و گومان و سەرسوڕمان بێت خوێنەر بەرەو پرسیارو نادیار ببات جیهان بینی کەشف بكات.
ئیلویت دەڵێت(زمانی شیعر پێویستە لەئاستێکی بەرزدا بێت) هەندێ شیعر هەیە زۆر قووڵە کەچی شیعرییەتی تێدا بەدی ناکرێ هەر شیعرێکیش لەزمانی ڕۆژانەوە نزیك بێت پێی ناوترێ شیعر ..یان دەتوانین بڵێین شیعر بەڕێبازە ئەدەبییەکان ناپێورێ،بەڵکو بەشیعرییەتەوە شیعرە ڕێبازەکان بەهای شیعریی بەشیعر نابەخشن...
لەم ڕوەوە دەمەوێت دیدو سەرنجی خۆم بخە ڕوو بۆ کۆمەڵە شیعری هاوڕێمان شاعیر مەریوان قەرەداخی بەناونیشانی (دنیای بێدەنگی) جارێ ناونیشانەکەی ئەوەمان پێ دەڵێت

لەناو ئەو بێدەنگییەدا دنیایەك دەنگ هەن دەنگ هەڵدەبڕن لەقەیرانی خۆشەویستی و قەیرانی نیشتمان و ناعەدالەتی و نالەباری ژیان...دەتوانم بڵێم هەموو ئەم بێدەنگیانە ناوەڕۆکی شیعرەکانییەتی کە شاعیر لەگەڵیدا دەژی.

ئەمەش جۆرێکە لەڕاستگۆیی،ناکرێ ڕاستگۆ نەبین لەگەڵ شیعردا..دەتوانم بڵێم تاڕادەیەك شاعیر توانیویەتی لەگەوهەری شیعر نزیك بێتەوە..شیعریش کاتێك شیعرە فۆرم و ناوەڕۆك پەیامی خۆی بگەیەنێت..ئەم شیعرانەی شاعیر تاڕادەیەك توانیویەتی لەشیعری سەردەم و نوێ نزیك بێتەوە.تێبگات نووسینی شیعر وشەو ڕستە ڕیزکردن نییە .هەرچەندە هەندێ لەقەسیدەکانی درێژی پێوە دیارە یان زۆر جار وشەکان دووبارە دەکاتەوە بەڵام لەکۆتاییدا توانیویەتی لەشیعرییەت نزیك بێتەوە،یاری بەوشەکان بکات و هەڵخلیسکانیان پێ بکات.
زمانی شیعرو وێنەو موزیکی ناوەکی فەراهەم بکات ، زمانی مەریوان زمانێکە تاڕادەیەك سادە زمانێکە هەوڵدەدات لەفۆرم و ناوەڕۆکدا سەرنجمان ڕاکێشێت بەتایبەتی لەپۆستەرە شیعرییەکانیدا زمان و وێنەو موزیکی ناوەکی میتافۆرو لێکچواندن و باکگراوندی فکرو مەعریفە چاو بکەنەوەو خوێنەر بەرەو ئاقاری سەرسوڕمان

ببەن،ئەوەی تێبینییە لەلای من حەز دەکەم بیدرکێنم دەبێت شــاعیر هــەوڵ بــدات هەمیشــە لەشــیعرییەتەوە نزیــك بێت،چونکە شیعرییەت وا لە شیعر دەکات لە تاك واتاییدا گـیر نـەخوات، واتـە فـرە ڕەهەنـدی بـدات بەدەسـتەوە..زۆر گرنگە ئاگاداری چڕی زمان بین لەشیعرا،تازمانمان چڕ بێت زیـاتر دەتـوانین لەگەوهـەری شـیعر نزیـك بین.جگـە لەچـڕی زمـان وێنـەی شـیعری کۆڵەکـەی شـیعرە شـاعیر بـۆ ئـەوەی خولیاکانی بەوێنە دەر ببڕێت پێویستی بەمیتافۆر میتـافۆر بەواتای سـەروو دێـت .یـان بەواتایـەکی تـر وشـە لەسـەروی واتای خۆیـەوە هـەڵگری واتـای تـر بێت.هاوڕێمـان (مـەریوان قـەرەداخی ) تاڕادەیـەك توانیویـەتی فاکتـەرەکانی شـیعری نوێ لەشیعرەکانیا بوونی هەبێت.

هیوادارم زیاتر پەرە بەچڕکردنەوەی زمان و وێنە و موزیکی ناوەکی و باکگراوندی مەعریفە بدات پێم وایە هەر شـیعرێك نـەیتوانی مەعریفـەو زانیاریمـان پێببەخشـێت،لەلای مـن نەیتوانیوە بگاتە شیعری باڵا.

رۆژ هەڵەبجەیی / سلێمانی

## بەدەمامکی مۆدێرنەوە... گوناهمان بەردایەوە



مرۆڤ چێبووە لە گوناه،

ئاهی تانەی مرۆڤەکان بوو،پەروانە رێی شەمعی ون کرد

نەورەس دڵی لە دەریا شکا،

لە کەناری بێ ئۆقرەیدا پڕ بوین لە وەرین...!

خودی خۆی ونکردووە،مرۆڤ

ئەو دەمەی دەفری خۆشەویستی ژەنگ دەگرێت

ڕوانین پڕ دەبێت ، لە شەقامی دڵشکان

گوڵەکان پڕ دەبن لە پەژموردەی

شکۆفە لە ناو سنگی گێلاسێکا جۆلانە ناکا

گوناه بوو ڕاپۆرت درا لە ئەستێرە،

دڵی هەوریان شکان ،باران پێنەکەنی و

زەوی وەك مەنجەنیق ، ڕۆژ پرمان بکا لە خێسە...

گوناهی مرۆڤەکان بوو ،لە سروشت،
هەتاو خۆکوشتنی لە هزریا ڕواند
گزنگ بۆ ئەبەد ، لە ئاسمان تۆرا
وەرزەکان تێپەڕدەبن بەشەلە شەل
بەفر سپێتی لە بیرچێ و
چیا پربێت لە دەوەنی سوتێنراو...!
گوناهو تانەی ئێمە یە،لە وەرزەکان
ئەو ساتەی سروشت ژان گرتی ، چیمان کرد...؟
دەستی تاوانمان، بەپرچی سنەوبەر پاکردەوە ،
لەکوشتنی درەختێکدا
زەلکاوی مێژومان هەڵدایەوە ،تا تۆڵە بکەینەوە!...
سیخناخ بووین ،لە کفری قابیلەکان
مەست بووین،بە پێکی شەوە زەنگ
بەرلەوادەی خۆی گوێزمان تەکاند و
جۆگەلە باریکەکان
لەسەر میراتی ڕووبار بانگەوازی جەنگیان کرد و
شەوەبرینگەکانمان پڕکرد لە پرتەو بۆڵە ...!
بانگەوازی شەڕمان کرد و
کێ برِکێیان بوو،
تابچینەوە بەرەی جەنگ...!

خەتای ئێمە بوو

ئاسمانمان لێوان لێو کرد، لە شپرزەی خەتی وای فای

ڕێڕەوی باڵدەکۆچەریەکانمان تێکشکاند

شەمشەکوێرەمان لە ئێوارانی  شار دەرکرد

بەرامەی خەتاکانی مرۆڤ، هەموو دنیایی گرتەووە

سنورمان لە سروشتا ناشت

شەرگاکان تەژی بوون ،لە گوللەی گوناه، بە تەکنەلۆژیا

پاشماوەی سەنگەرەکان بەکۆڵێ جوێنی مۆدێرنەوە،

جەهلیان بەردایەوە...

گوناهی ئێمەبوو،شەقامەکانمان پڕکرد

لە پرچی ئەو ژنانەی نەیانزانی بۆچی کوژران...!

یان ئەو کچانەی ماڵە مۆرەکانیان بەتاڵان بران

پاپی بێهودەیی پێ دەکەم

خۆم دەبینم بەتەڕیی لەحەشارگەی ماسکێکەوە

بەدەمی دوو کانۆلای پەپولەوە،

بەتەنافی یەئسەوە،

لرخەی هەناسەم شەقامی خۆش بەختی تەنیووە...!

چ، نامۆیە دەمامکی ژیان
چەند سەختە ژانی هەناسەدان ،لەبۆشای هەوادا
دەڵێی هەوا ئاگرە و هەڵیدەمژم
دەڵێی با دۆزەخە لەڕۆحما و
لە هەناوما پارچەی ئاسمان...!

چەند قورسە خەتاکانی مرۆڤ
باج بە گیان و دڵشکان دەدەن
شەپۆلێکی تەم و مژاوییە تاکێك پۆستاڵە زەوی
بۆ هەر جێیەك دەچی
دووریانی مەرگ و کەژاوەی کوشتن و
فەزایەك بۆ لەخاچدانی تروسکەی خەیاڵ
مەودایەك بۆ گەشتنەوەی فوارەی فیراق...!

چەند شەرمەزاریە،ئەم تەمەنە
لە ژەنەڕاڵێکی بەزیو دەچێ
چەند خەجاڵەتیە لە وشکاییا تینووبین بەسەراب...!

گەمەی ژیان بیٚ مانایە
جانتایەکی قورسە پڕە لە شەکەتی
لە دەربازبوون بەرەو ئیٚستا دەپسیٚت و
دەکەویٚتەخوار!...
دەکەویٚتە ئامیٚزی ی ڕەشەبا
هەرچی نهیٚنی و گوناهی ئابڕوو بەرە ،
دەکەویٚتە سەرەتاتکیٚ...!

چەند سانایە پەرتبوونی تۆنی لاویٚتی
بەویقاری نەزیفی تەکنەلۆژیا
بەتانەو تەشەری سەبکی سیاسەت
تاریك و نادیارە ئاسۆ
لەنیٚو تارمایی درۆ و خیانەتدا مەودای بینایی کەمە
هەر (عەزازیل)ە دەستی ناوەتە بینی ڕۆشنایی
چەند ناچیزەیە دەنگی واعیز و موریدەکان
لەوەتەی هەن دلٚمان دەدەنە بەر هاژەی گریان

ویٚرانەیە ئەم ژیانە
گم گمەی کۆتریٚ نابیستی، باسی خۆشەویستی بکا
باخەوانیٚك بەدی ناکەی قاچی گولٚیٚك بشوا
فریاد ڕەسیٚ نی یە خاشاکی ڕق فڕیٚ بدا

چەند بەستە زمانە باڵندەی باڵکراوی پێکەنین
وێرانەیە ژیان، کە ماسکە بە پێکەنین
لە هیچ شوێنێکی ئەم گەردونە خۆی نادۆزێتەوە
لە عەدەمەوە دێتەوە پێکەنین...!
گۆزەی خۆشەویستی پەرت بووە،
برینی ئەم ئاوانە، تا ئاسمان ڕۆشتووە،
لێوێك نییە ئاوڕبداتەوە...

دێوەزمەیە خەونەکان
ناتوانن لە تاو گوناه،ماچێکی کاڵ لەخۆیاندا چێ بکەن
ناتوانن پرچی چەپکێ تیشك،بەخۆیانەوە گرێدەن...!

سەردەمێکی نغرۆیە ژیان ، بەختەتاکان
چەند تۆزاویە تەمەن، چ تەموو مژاویە یاسایی دارستان

کە، مەئیوسم، ناتوانم پەیکەرێك بم،
لەشوناسی ئەو باڵندانەی
لەپاڵتۆی ئاسماندا باڵیان ناشت...
یان بنەماڵەی ئەو گوڵانەی
لە درزی باراندا خۆیان کوشت...!

بەهێ ژوانێکی نییە، دەست بکاتە ملی زەردەپەڕ
ترێ نوستووە ، مەیلی ناچێتەوە سەر بەرسیلە
بەڕوو کڵاوەکەی با بردی،
کەسەری بەست بەماسکی مۆدێرنە...

شەوی زستان چەند ساردە!
ناگاتە وەرزی بەستەڵەکی بێدەنگی تۆ
لە گەرمی پێخەفی شیعردا
بۆ دیدارت تەزیووم...



سەبای دەنگت...
دەمباتەوە سەر وەرزی نوێبوونەوە
چ، ناوەخت بوو بارانی بزەیەکت!
لەم کۆڵانی بەر تەنگی تەنیاییەوە تێپەڕبێ
دەزانی غەریبێکی هەڵتورتاوم
بەئاوازی دەنگت!

وەك زەرنەقوتەی بەر زریان
وەك پەپولـەی پاش ڕەهێڵە
تەزیووم بە وەرزی بێدەنگت...

ناکامم، وەکو توانەوەی مۆمی بەر ئاگردان
بێنیازم وەك نێچیرێکی هەڵهاتوو لە داوی قەدەر
شپرزەم و نۆبەی هەناسەم بۆ ئەژمار ناکرێ
گەڕیدەی سەرخاکێکی شێدارم و
بێ وەفایی یەکەم وەرزی ڕوانە تێیدا...
شەهری دڵم، لێم بڕوانە
جگە لە ڕەنگ زەردیم ،بە ئاسمانی یادگارییەکانتەوە
وەکو مەلێکی تار
نغرۆم و سەوداسەرمە بۆ مەملەکەتی بینینت
منداڵ ئاسا ورکی ڕوخسارتم گرتووە
ڕابردووم پڕە لە تۆ...

داهاتووم یەخسیرە لە وشەی نەوتراو
کە، دەبینم خۆمم بۆ ڕاڤەناکرێ
گەر بڵێم بیرم نەکردوویت
نالەباری لێوان لێوە لە من
چونکە، بیرم نەچوویتەوە...!
چونکە، هێندەی دڵۆپەی بارانی وەرزی تەزین
هێندەی ڕۆژەکانی تەمەنی ڕابردووم
هێندەی کاتەکانی بیرکردن...

هێندەی چاوەڕوانی بیابان بۆ باران
هێندەی تامەزرۆی ڕوخساری گریاو بۆ پێکەنین
هێندەی نابینایەك بۆ بینایی...
هێندەی لێوی وشك بۆ تەڕئاوی...
لەوەش زیاتر بیرم کردووی
ئەزانی بۆ ؟
لەبەرئەوەی خۆشم دەوێی...

## ئازارەکانی بێڕەنگی



دەچیتە بەر تۆفانی ڕق و هـیواکانم هـەڵدەخەیت
لـە ناو تابلۆی خەمەکانما چاو لـێك دەنێیت
ڕەنگی بێ ڕەنگیم لـە خاچ دەدەی!
بێ ئەوەی بمخوێنیتەوە
وەك نامەیەکی نەبینراو دەمسڕیتەوە..

ئەمە ڕوانینی منە
پرچت دەکەمە سێدارە و
بۆ گەردنی هـەموو شەوێکم
لـە کەنار ژیان و مردندا

ئەمە وەرزی شوومی بیرکردنە
خەندەیەکت بە شەماڵێکدا،
ناگاتە گەرمەسێری ڕوانینم...!

لە کۆڵانە پێچاوپێچەکانی دڵمدا
بۆنی شوێن پێکانت ئەکەم
وەك شەرابێك
ڕۆژ لە دوای ڕۆژ
یادگارییەکانت چێژی زیاترم پێ ئەدەن
بێ ئەوەی بیرم لێبکەیتەوە...

سەرم پڕە لە خەندەی تۆ
قەهـری خەونەکانم تۆیت
چاو دادەخەم، لەپێشمدای
وەك نازناوی منداڵیم بەستراوی بە ڕۆحمەوە
بۆ ئێوارێ، کە بێزارم ڕەشماڵی تەنیایی هـەڵئەدەم
لە تێنوسی یادەکانتا بمنوسەوە...!

دڵ دەخوازێ
خەندەیەکی سەهـۆڵ ئاسات بشکێنم و
سەری تەزیومی، لـە دووریتدا
پێی گەرم بکەم
بۆ ئەوەی بەهـۆش خۆم بێمەوە

ئەمە کاڵفامییە یان عەشق...؟
ئەچمە ناو هـەر بەشێکی یادەوەریم
بەناوی تۆ دەست پێ دەکات و
بەناوی خۆم کۆتایی دێ !
چلۆن تۆ دڵت بردم و
منیش خاڵی کۆتایم نەخشاند !
وەك هـەورێکی کۆچەری
گرمەی هـەنیسکم ئاسمانی گیانی تەیکردووە
لە وەرزی خاکی وشکی دڵت نەبێ
بەخورِ داناکەم...

شەوێك نییە
ئیلهامی وشەیەكی بێهۆشم یەخسیر نەكەم
سەری نەخەمە ژێر پێنوسی هەستم
نەكا بڕوات، بەبێ ئاگا
لە قاپی جیرانێكی بەوبەختیم بدا
وابزانێ ئێوارەیە و بەرەو ڕوانین نیگا بكا
نیگا بكات، بە دیار بێدەنگیتەوە،شەو بەڕێكا

من بۆ ڕاڤەی خەمی نیشتیمان
خەڵوەتم گرێداوە بە بونمەوە..
تۆش ،بێئاگا نەغمەی سەرمەستی ئەچڕی و
سرودەكانی عیشق دەڵێیتەوە

چ ،تابلۆیەكی فەنتازییە...!
لە مەملەكەتی دابڕاندا
بە دیار سمبولی خەندەیەكتەوە
دەچمە ناو وەرزی هەڵوەرین ...!

ئینجا خۆم دەبینم لە مندا
سەرنجەكانم بوون بەدووان
ڕوانینەكانم ،بە دوو بەش
من لە ناخی شەهرەزاد دا

بێدەنگی پێناسەمە و
هـەڵوەرین ناونیشان و
مەزرا سوتاوەکانی دڵم نەخشەیە و
مەودای بێدەنگیم لە ئەودا
وەك دەریایەکی بێ بن
لرفەی شەپۆلەکانم ناگاتە کەنار...

ڕەجاڵیم خاکێکی سنوردارە
وەك باڵدارێکی دیل
لە ناو قەفەزی دڵی  ماڵێکم چێکردووە
سروودی خۆشنودی عیشق دەڵێمەوە و
خۆم مەڵاس داوە بۆ فڕین...

لە وەرزی سڕبونی خەیاڵیدا
دنیایەکم لە بێدەنگی!
لە تیانووسی شیعرەکانما
چەقۆ ئاسا هـەڵچەقیوە
بە نەزیفی خەیاڵەکانمدا و
بێ مروەت، لەخوێنمدا، دێت و دەڕوا
ئای ئەمە چ، گاورستانێکە!

**لە شەبەنگی هـەستی ئەودا**

**ئازادێکی بیری خۆم و**

**دیلێکی دوورخراوەی**

**وەلانراو لە مەملەکەتی نغرۆبوون...**

# باوکم



پێکەنینەکانی باوکم پڕە لە بەرائەت

کە، دەدوێ باخچەکەمان گوڵ دەگرێ

هێندە گوفتار شیرینە

ماڵمان دەبێ بە پورەی هەنگ...!

لە گیرفانەکانی باوکمدا دیوانێك هەیە

بەناوی قسەی نەستەق

نوقولێ ووشە و پەند و ئامۆژگاری

خەم ڕەوێنی ڕۆمانێك لە پێکەنین...

سەرگوشتەی تێڕوانینەکانی باوکم

پڕە لە ژیان و خۆشەویستی

دەڵێت:-

(گوڵتان خۆش بوێ ئەدی، باخ بێ بڕشت نابێ)

دەڵێت:-

پەپولەکان حەزیان بە گەشتە

!تابلۆیەکی چەند ناشرینە

ببیە بکوژی مێرویەکی خاوەن گەرا...

دەڵێت:-

تەمەن کورتە پێ ناگەین، لە ژیان تێبگەین

ژیلەمۆی عیشق بکەن، بە ئامانج...

لە چاویلکەی باوکمەوە، لە ژیان بڕوانە
ئەستێرە وەك مانگ دەبینی،
مانگ خۆی ئەبێ بەنور
سروشت بەدۆست
باڵندەکان دەبنە خۆشەویست
کانیاوەکان وەك هاوڕێ
ماسی سەمات بۆ دەکا...!

وشەکانی باوکم میسکی شیعریان لێدێ
گەر چی هەرگیز شیعری نەنوسیووە
بۆ یەکجاریش نەمبینیوە بە مۆنی
هەرگیز ڕوخساری خەماوی نیشان نەداووین
ئەگەر ڕۆژێ دلتەنگی بوبێ
ڕەنگە بەدزی خوداوە گریابێ
بۆ ئەوەی زەوی شەق نەبا...!

لە قاوەڵتی خوانی ماڵی باوکم بڕوانە
بە شنەی پێکەنینەکانی قەیسیل کەروێشکە دەکا
بارینی نمەی خەندەکانی دلت دەکا بە سەوزایی
لە پەراوێز و تەنیایی دا،مەزادێکە بۆ ووتەی خۆش...

ئێوه وەك من بن

وێنەكانیان لـه كەوانی دڵ دابنێن

وتەكانیان تۆمار بكەن

ڕۆژێ دادێ دەنگیان نادات،لـه زەنگی بیستنتان...!

دیدارتان ئەچێته لای تاشه بەردێكی گۆڕستان

ئەوكات بۆ هەوێنی خەمباریتان

هەرجارەی مسقاڵێك لـه ووشه و

سەرنجێكی ڕوخساریان بكەن به تێشوو، بۆ بێداریتان

لـه ئازاری ویژدان قوتاربن

باوكتان خۆش بوێت،وەك (من)

# شەهرەزاد



نیگای خەیاڵت ،چ ئیلهـام بەخشێکە!
لـێت دەڕوانم ...
پەرش و بڵاوی بینینت
وەك غوباری پێش زریان
قەتماخی شاری گرتووە
ئاڵۆزیت پێناسەی ڕوانینتە
وەك سەربازێکی هـەڵهـاتوو
وەك نێچیرێکی سەرلـێشێواو
وەك باڵدارێکی لـە گەل جێماو

ڕوانینەکانت بڵاو بۆ قوڵایی دڵی ئاسمان
خەیاڵت پان و بەرین
هەرسەرنجێکت بەرتەقای ڕۆمانێك
پڕ لە وشەی نەبیستراو
دانیشتوویت ،
لە باڵەخانەی بێدەنگیتەوە
تەماشای سووتانی هەستم دەکەی
چلۆن وەکو گەڵایەکی هەڵوەریوو
لە خەزانی ڕۆحتدا
بەرز و نزمی هەڵدێر و نشێوی ژیان
دیلانەی مەرگم پێ دەکەن ،لێم دەڕوانی!

بەو خەندەوە لێت دەڕوانم
خەیاڵت لە نیگادا چیێ کردووە
بە گوژمی حەرف باران سەرنجم پاراو دەکا!

شەهری دڵم لێت دەڕوانم...
پەری ئاسا لەسەر کەناری دەریای دڵم
بە پەڕەموچی وردە ماچ
تاڵەکانی زوڵفت دەدوێنی
هەمیشە خەیاڵ دەکەی
دەڵێیت:- چەند کەشتی عیشق

لە دەریای بیٚ بنی دلّمدا
غەرق بوون و نە گەشتنە کەنار ؟
چەند ،کاپتنی تابلۆی خەیالّ
چەند،گوژمی شەپۆل لوشی داون و بوون بە ئاو ؟
تەماشای حەزەکانم دەکەی چەند تامەزرۆ
بۆنی میسکی گیانت دەکەن
دەت بینم، بە یاسایی کێشکردنت
دەڕوانیتە هەستم
چ قودرەتێکە خودا
بە سەرنجێکت باکور و باشوری
ڕۆژهەلّاتی هەستم داگیر دەکەی!
موعجیزەیە خۆحەشاردان لە تۆ
ئەی فریشتەی خودا!

لە خێرایی دەنگ زیاتر و
لەژمارەی ئەستێرەکان زۆرتر و
بەگوژمی تیشکی ڕۆژ ڕۆشنتر
ترپەی دلّم ،پێدەزانم
کە دەڕوانیتە چاوم
بۆن و شنەی سەرنجت
ئالودەم دەکا، بە هەستی بینینت!

شەهـری دڵـم وەختێ دەدوێیی
دەنگت ناگاتە هـەستم
دەبمە تۆزی بەر ڕەشە(با)
دەبینم دانیشتوویت و
جارنا جارێ دەڕوانیتە
تابلۆی ئاسمانی شەوەتار
یەك یەك ئەژماری ئەستێرە کشانی بەختت دەکەی
تا ببینی بەڤینۆسی عیشقی مندا نوساوە دڵ
نەفامیە دەربازبوون لـە تۆ ئەی دزی دڵ.بەندەی خودا

بێدەنگیت کردە قیبلـەی پرسیارە بێ وەڵامەکان
نەهـاتی ،بۆ سەر مەزرا سوتاوەکانی ڕۆح
نەهـاتییە،ڕوانینی
دیدەنی ژوانێکی بێ ئۆقرەی لـەشی شەکەتم
تا بزانی چۆن دەسوتێم
تا ببینی چۆن دەگرییەم؟
گریانێك بۆ ساتەکانی پێکەوەبوون
فرمێسکێ بۆ ڕۆژەکانی جودایی بوون
ئا ...بەم هـەموو برینەوە
بەم شەڵاڵی نەزیفی دابڕانەوە
بەر لـە مەرگی هـەڵالەکانی سەرلێو...

بەر لە دواهەڵمژینی سوێیەکی سەخت
لە مەعبەدی چاوەکانت...
لێو گێلاسی بەهاری نیگا ئاڵ
چاوکاڵی یەخسیری ئارامی ڕۆح
لەم ئێوارە خوێناویەی دەستی قەدەر
لەم زەردی خۆرئاوایی خۆ کوشتنە
لەویسالّی هەزران خەونی بار بردنە
نەگەیشتی ..بۆ نەهاتی ...؟ شەهری دلّم

خیانەتت لە چاوت کرد
لێرە نەبووی!
ئێوارە ڕاگوزەری
سووتانی، ئەم ڕۆحەت نە بینی
لێرە نەبوی!
تا...ببینی ڕوخانی ئەم پەیکەرە
چلۆن دەڕمێتە، نێو تابوتی بەرائەتەوە
چەخار شەهری دلّم
لێرە نەبوی!
تا...ببینی
بێدەنگی مردنی عاشقێ
لەم وەرزی خەزانە

تا چیژی ئەم وەرزی گریانە
چلۆن گەڵای خەیاڵی هـەڵ دەوەرێ
شەهـرەزادگیان، لێرە نە بووی!

درەنگ گەشتیت
هـاواری قوڵی دەمارەکان و
نرکە نرکی دڵت نەبینی ؟
چلۆن، بەتیغی چەقۆی بێ تۆیی
ڕەگی گوڵی ڕەونەقی ئیلهـامی دەبڕێ
وێنای دابڕانی ئەبەدی
وێنای دوا نیگای ماڵئاوایی
وێنای دوا فرمێسکی تۆ
وێنای دوا هـەستی ساردی تۆ
چلۆن دەمارەکانی دەبڕێ و
چلۆن هـەستەکانی دەمرێ
داخی داخم، لێرە نەبووی..
تیغی خەمی تیژ و گەرم بۆ مردن
گەرم وەك ماچەکانی تۆ
تیژ وەکو تێڕوانینەکانی تۆ
پڕ چێژ وەك باوەشە نەرمەکانی تۆ
داخی داخم لێرەنەبووی !

لێرەنەبوی...
دڵۆپەی ئەو خوێنانە ببینی
ڕەنگی ڕابردوو دەکەن
چۆن بەدەم ئازارەکانەوە نرکە نرك دەکەن
مردنی ئەم عاشقەت نەبینی
دواساتی ئەم خۆ کوشتنەت نەبینی
شەهـرەزادگیان ...دڕەنگ هـاتی و لێرە نەبووی !

نەگەشتیتە دوا وەسێتی ئەم شاعیرە
لە سەر  پروشەی دوانیگات
لە سەر گۆ گۆی پەنجەکانت
لە نێو تاڵ بە تاڵی زوڵف و پەرچەمی تێك ئاڵاو
بە حەرفی بینینەوەت دوا خۆکوشتن بنەخشێنی
نەگەشتی و ببینی..

چاوی پڕ، لە ئەشکت نەبینی
قولّپی ڕژانی ئەو هەموو خوێنەت نەبینی
دوا تاسەی خنکاوی ئەم عاشقەت نەبینی
دەیرِوانییە زەردەپەرِ
وێنایی چاوە کالّەکانی تۆ
هەستەکانی دابەش ئەکرد و
بەنێو گولّی ئینجانەکانی موحیبەتدا
سەفەری دوا وێستگەی تۆمار ئەکرد
سەفەرێ بۆ دورگەکانی غوربەت و
سەفەرێ بۆ ئاسمانی غوباراوی تەمەن و
ڕۆچونێ دەچێ ئیتر نایەتەوە
نێو ڕێگاکانی خۆش ویستن
ڕێگا پێچاوپێچەکانی دلّی تۆ و
ڕێگای ڕێبوارێکی وێلّ بەدوای ماچی خودایی...
لێرە نەبوی تاببینی
ببینی چۆن پاسارییەکان
حەیرانی ئەم دلّ کوشتنەی بۆدەچرِن

نەتبینی !

هــەناسە ساردەکانی دەکردە گەردنی
ئەو گوڵە سپییانەی وەك ناخت سپی بوون
نیگاکانی دەبەخشیە ئەو پەپولانەی
بەگەردنتا هــەڵواسرابوون
دەستەکانی کردبوونە
کەڵەپچەی عیشقی تۆ و
لێوی زەردو ڕوخساری خۆی دابووە دەست
قەدەری دابرانی ئەبەدی
لێرە نەبووی تابیبینی...

# فەلسەفە چی نیە؟!

شیعر وەك بەشێك لە دنیا فراوانەكەی ئـەدەبیات، زۆرجـار بەیەك قونەو بازی خێرا خۆی هەڵئەداتە جیهانە گەورەكـەی فكـرو فەلسەفەوە، بەمەش شیعر لە یەك كاتـا هـەم شـیعرەو هـەم هـەوێنی ئەدەبیاتەو هەمیش ڕێگایەكە بۆ ئاشنابوون بە فەلســەفە(بیركردنەوەو پرسیارو گومان و دواتر وەڵام و چارەسەرو ئیتر ئەوانە) شیعر جگە لــەوەی، كــە ئـارامیی دەرونــی ئینســانەكانەو چــێژێكی ســەیری خەیاڵاویی و هەندێجار واقیعییش ئەبەخشێتە مرۆڤ، لە هەمان كاتـدا هەنــدێ جــار بــە جوڵانــدنی فكــرو ختوكــەدانی بیركردنــەوەو ئاڵۆســكانی گومانــدان و هورووژانــدنی پرســیار، خانــەی فكرمــان ئەمانباتــە شــوێنێك، كــە ئــیتر جگــە لــە ڕامــان و بیركردنــەوەو سەرسوڕمان، شتێكی ترمان بەدەستەوە نـاهێڵێ، ئـیتر شـیعر ئەبێتـە وابزانم باسێكی تر، ئەبێتە چوزانم بڵێم چـی تەقریبـەن جۆرێـك لــە فەلسەفە.

من هەرچەندە توشی ڕەخنەو گلەیی و گازندەیەكی زۆر بوومەتەوە، بەڵام دەیانجار ئەمەم وتووەو لێرەشدا ئەیلێمەوە فەلسەفە، ئەگەرچی (بڕێ كات) ئـاڵۆزو وشـك و بێتامـەو لــە دەوری كۆمـەڵێكی بـە حساب كەسی تایبەت و ئەكادیمیی و پسپۆو مسپۆڕو تڕو تەشـقەڵە خول ئەخوات، بەڵام زۆربەی كات سادەو ئاسان و خۆشە و لە ناو

کۆی خەڵکایەو ئەکرێت لە شوانێکەوە تا ئەگاتە چوزانم کێیەك، لە مەلایەکەوە تا پینەچییەك، لە جوتیارێکەوە تا دارو بەردێك، لە عەرزەوە تا عاسمانێك، بیرکردنەوەو قسەو کرداریان فکرییانەو قووڵ و پەیامدارو فەلسەفییانەبێ،

ئێ خۆ فەلسەفە عەرزەی ڕووکن و ئۆتۆمبێلی جامڕەش و کۆمپانیای نەوت نیە تا تاپۆ بێت بە ناوی کەسێك یان چەن کەسێك یان گروپێکەوە، فەلسەفە جیهانێکی فراوانی بێ سنوورە، کە سەنتەر(ناوەند) تیایا مرۆڤ و بیرکردنەوەی مرۆڤە. نەك هۆڵ و قات و ڕیبات و شانوشەوکەت و سەرمایەو عەینەك و قژی درێژو ئەم شتانە، چونکە من هەموو کات وتوومە؛

فەلسەفە تەیارە نیە، فەلسەفە سەر بە عالەمێکی تر نیە، فەلسەفە لە ناو فکردانی مرۆڤا هەڵئەقوڵێ و نەشونما ئەکات و گەورە ئەبێت و هەر لە ناو فکردانی مرۆڤیشا عەمری کۆتا ئەبێ و چاوی دەردەچێ و ئەمرێ.

زۆر بە سادەیی و خۆمانە فەلسەفە، بیرکردنەوەو گومان پرسیارو ئینجا گەڕان و کنەو پشکنینە بۆ وەڵام و چارەسەرو دەرمان بۆ دەردو ئێش و کێشەو نەهامەتییەکانی ئینسان و زەوی و کۆی سروشت و ژینگەو گیانلەبەران، ئیتر ئەو قسەو چەمك و تیۆریایانەی تر هەرچەنە زیانێکی زۆریان نییە، بەڵام مەرجیش نیە ئیتر ئەوانە فەلسەفە بن و قسەکردن لە دەرەوەی ئەو ڕێبازانە

کوفری ئەکادیمیی و حەرامی فەلسەفی بێت و کەس مافی ئەوەی نەبێ ئەلفێك لەسەر جەنابی پایەداری مەزن بەرێز فەلسەفە، هەڵبێنێتەوە.

ئێ، ئێستا با دوو وشە لەسەر ئەم شیعرانەی مەریوان قەرەداخی بنووسم، پێش هەموو شتێك تۆی خوێنەر ئازادی کە ئەم دەقانە بە شیعر ئەزانێ یان بە میعر، مەریوان بە شاعیر دەزانی یان بە وڕێنەچی، چوزانم ئازادی چۆن بیرەکەیتەوە لەم بارەوە،
بەڵام ئازادیی ئەوەش بدەرە من، کە بیژم: بەڕاستی هەستێکی خۆشم هەیە، کە شعری وەها شاعیرێك هاتە بەردەستم و لە کاتی خوێندنەوەی زۆربەی دەقەکانا هەستم بە دەرکەوتنی فەلسەفە تێیدا کردووە، ڕێگەم بدە، کە ئازادانە بلێم: شەقێ لە لایەنە ئەدەبیی و شیعرییەکەی ئەم شیعرانەی مەریوان هەڵدە، بەڵام ورد ئەم شیعرانە بخوێنیتەوە، ئەوا بۆت دەرەکەوێ، کە تۆ بێ ئاگایانە کەوتوویتە ناو گۆمی فەلسەفەوە، بیردەکەیتەوەو ئەو هەموو گومانەت بۆ دێتە پێش و ئەو هەموو پرسیارە لە مێشکتا ئەتروکێن، مەریوان هەر لە سەرەتاوە بێدەنگمان ئەکات و نەرم نەرم دەستمان ئەگرێ بۆ لای پرسیاری سادەو گومانی قووڵ و شتی تریش، شتی ترش نا، شتی تری_ش، من شارەزاو شت نیم لە خوێندنەوەی دەقا، زمانی نووسینیشم ئەوەنە جوان نیە، تا بتوانم وەك بەشەر وەسف یان ڕەخنەی دەقێ بکەم من زۆر لە خۆم ناکەم و تاقەتی موجامەلەی

هەرزەکارانەم نیە، ئەوە ئەنووسم، کە هەستی پێ ئەکەم، گرنگی بە پێش و پاشی دەقیش نادەم، ڕەنگە گرنگترین شیعری فەلسەفیی و باڵام لە بیر بچێ و لەسەر شیعرێکی تۆزێ لە شیعرچوو قسە بکەم، من ئاوام، چونکە زەخت لە خۆم ناکەم و ئێ بەسە، با بێینەوە سەر فەلسەفەو شیعرەکانی مەریوان، لە جێگایەکا قسەیەکی سادە، بەڵام پەیامدار ئەکێشێ بە بناگوێماناو دەڵێت:-

(کتێبخانەکەمم فرۆشت و ئێستا تەنیایی و نامۆییم کڕیوە)

ئەها کتێب هەموو کات ناتوانێ مرۆڤ تەنیا لە فکرو نامۆ لە هەڵسوکەوتدا، بکات، بەڵکو ئەبێ لە کتێبەوە دووربین، بۆ ئەوەی تەنیایەکی بیرکەرەوەو نامۆیەکی یاخیی بین، تخوا چەن جوان لە هەنێ شوێنا باسی دارا دەکات، هەندێ شوێن باسی ئیجەو یەشار کەمالی خۆمان، هەندێ جار باسی عەشق و مەشق دەکات، هەنێجاریش جا باسی چی نەکردووە؟ ماڵیم ئاوا کرد بەتەمابووە بەم شیعرانە لەمسەری دنیا بۆئەوسەری بە بێدەنگی قسەیان لەسەر بکات و لە هەر بن دارێك و قەراخ ئاوێك و سەر بەردەنوێژی کانییەك و لای تولەڕێیەك تاوێ بوەستێ و چوار پێنج ورتە ورتەیان بۆ بکات، بۆیەش ئێستا، کە ئەم دەقانە لەبەر دەست و چاوی منایە، ناویان (دنیای بێدەنگی)یەوبە بەبێ دەنگی دنیایەکی بۆ خۆی خولڤاندووە( ئێمە قژمان هەیەو کەچەڵین) سەیری ئەوە بکە

که مەریوان ئا لەویا چۆن ڕامان ئـەگریٚ و چ هەراوهوریایـەك لــە فکرمانا دروست ئەکات و ئەڵێت ئێمە وامان بیستووە کە( با بیٚ و باران بیٚ، هەر بۆ سەری کەچەڵ زەرەرە) کـە گـەورە بـووم ئینجـا زانیم، کە (بەو هەموو قژەوە چـەنە هـەژارین) ئـا لێرەیـا مـەریوان بابەتی دۆزی نەتەوەیەك و سروشت و فەلسەفەو ئەخلاق و ستەم و جەستەی ئینسانێك لێك ئەئاڵێنیٚ و ئیتر خۆتان بزانن چی دەرەچـیٚ، بەناڕاستەوخۆش پێمان یەژیٚ:-

(شەرت نیە هەموو مەرجیٚ شەرت بیٚ) ئەوەتا، کەچەڵیش نیەو بـاو بارانیش زەرەری هەیە بۆی، کەواتـە ئـەو پەنـدە خۆمـان خـۆش و خۆای عافوی کات. ئا لێرەیا حەزەکەم سەرنجتان بـۆ خوێندنـەوەی نامەکانی ناو ئەم کتێبە ڕاکێشم، ورد بیخوێننەوەو دواتر بێنـەوە بـۆ ئەم قسە هەڵێت و پەڵێتانەی من جا بۆتان دەرەکەویٚ، کـە هـەڵێت و پەڵێتیش چەنە کەڵکی هەیە. لە کـۆدی وشـەدا، هـەر بەجـددی کۆدی داناوە، بەڵام یەکەمجارە، کە کۆد ئەوەنە ئاشـکراو ئاسـان و ڕوون بیٚ، هەرکە داخلێ کۆدی وشە دەبیٚ

بیٚ ئەوەی هیچ بکەیت کۆدە کە شکاوەو وشەکان مـاون، ئـیتر ئـا لەویا دیسان ئەگەڕێیتەوە دنیا فراوانەکەی فەلسـەفە، کـورە قسـەم زۆرە بەس نامەویٚ زۆر درێژدادڕیی بکەم، ئینجا وەڵایی لە شـیعری هاوڕیٚ دوورە وڵاتەکەمدا، ڕێك باسی دنیایەکی وێرانـی دوور لــە پێکەوەژیانی پڕ ستەم و خیانەتکاریی ئەکات، بـە جۆرێـك ئاشـکرا

دەری ئەخات، کە بەڕاستی مرۆڤ ئیتر ماندووە، ویرانە،بێتاقەتە، چارەیە شتێ. تەبعەن ئەوەمان لە یاد نەچێت، کە لە ڕووی زمانەوانی و ڕێزمان و هەنێکیش لایەنی شیعرییەوە کەمێ ڕەخنەم هەیە، جاخۆ لە سەرەوە وتم حەقی لایەنە شیعرییەکەم نیە، ئەمە چەنی بە چەن؟

با لێرەیا شتێ تر بێژم ئێمەی مرۆڤ، ئێمەی کورد، ئێمەی چوزانم بەشەر، ئەگەر هاتوو دروست بیرمان کردەوە، واتە لەیەك کاتا هەم فەلسەفییانەو هەمیش ئەخلاقییانە، کە وابزانم دوو شتیش نین، بەڵام دەی کێشە نیە ئەگەر هاتوو بەو دوو ڕێگا بیرمان کردەوە، ئەوکاتە ئەگەینە گومانێك لەسەر بۆ نمونە ئازادی، یان بەختەوەری، ئەوکاتە پرسیارگەلی فرەمان بۆ دروست ئەبێ لەسەر چۆنێتیی دۆزینەوەی ڕێگاکانی گەیشتن بە ژیانێکی ئازاد و بەختەوەرانەی ئەخلاقی وەها، کە سنووری هیچ دروستکراوێکی تێدا نەبەزێ، دوای ئەمانە ئیتر بۆ وەڵام و چارەسەرە جوانخاس ناچارین ببینە تێکۆشەرو گەڕیدەو فەیلەسوف و هەوڵی جدیی و تەواوی خۆمان بدەین، بۆ ئەوەی دەی لێیگەڕێ خۆتان ئەزانن بۆچی ئەڵێم.

بەڵام ئەمە لە یاد مەکەن، هەرکاتێك فەلسەفییانە بیرتان کردەوە، یان لانیکەم بابەتێکتان لەسەر فکرو فەلسەفە خوێندەوە، کەمێکیش گرنگی بە تەماشای سروشت و گوێگرتن لە مۆسیقاو خوێندنەوەی شیعرو وەرزش بدەن، ئیتر بەدڵی خۆتان حەزەکەن واش مەکەن.

پرسیار

(ئاخر هەموو ڕۆژێکمان جەنگ بێ، نیگایەك هەیە بۆ ژیان؟)
مەریوان ئەو پرسیارەی کردووەو ئێوەش لە ناوەوەی خۆتان وەڵام و شتی بۆ بدۆزنەوە. منیش ئیتر کۆتاییم بە قسە هاورد من بە دۆعا و ئێوەش بە سڵامەت.

فەیلەسوفی بێ فەلسەفەی کورد

بەختیار مام حەمید

# پرسیار

زۆر دە ترسم هۆگرت بم ...!

بیانووم زۆرە بۆ بینین

لەبەردەم قوتابخانەکەتان دەبمە پاقلە فرۆش

لە سەرسوچی کۆلّان بەقالّ

لە ترافیکەکان گولّ فرۆش...

ڕۆژی چەندجار دێیتە ژووان...؟

زۆر لاسارم بۆبینینت زۆر شت دەکەم ...!

ڕۆژی سێ جار جەوزەی مۆلیدەکەتان دادەخەم

بۆ سوالّی ڕوخسارت ،دەبمە کەناس

بەشەق لە سەتلّی زبلّ دەدەم

گەرچی بالّندەم خۆشدەوێ

بە بیانوی کۆتر بازی

دێم و لە دەرگاکەتان دەدەم

ڕۆژی چەند جار دێیتە ژووان...؟

تا ئەو دەمەی بیرت بکەم

ڕۆحم دەبێ بە زانست خواست

بیری ڤیساغۆرس و لێکدانەوە و پیلان دانان

بۆ بینینت لە مێشکدا چێ دەکەم

دێمە ناوەڕاستی کۆڵانەکەتان
بەدەنگێکی هێواش و لەسەرخۆ هاواردەکەم:-
من کە حەزی گوڵمی سور و لێوی بەرسیلەدەکەم
تۆش سەوزەی جوان و میوەی شیعر
بەمەرجی عەشق و شیرینی
شەرتی دڵم بکە و بیبەرەوە...
ڕۆژی چەند جار دەبیتە کڕیار..؟

لە نزیك غەسلی لای ماڵتان کار دەکەم
شوێن دەست و پەنجەکانت
لەسەر جامی ئوتومبێلەکەتان دەناسمەوە
وەك تینو بۆ ئاو ، بۆنی هەناسەت دەکەم
چونکە ، بۆن و بەرامەی تۆی لێ نەبڕاوە
ئابەو شێوە بیرت دەکەم...
ئوتومبێلەکەتان بە گوڵاو غەسل دەکەم
هەفتەی چەند جار غەسلی دەکەن ...؟

تا ئەو دەمەی بیرت بکەم...
بەبیانووی بینینی تۆ
دەبمە پۆلیسی هاتووچۆ
هەموو ڕۆژێك دوای نیوەڕۆ
بەبینینی بیانوی تۆ

مەفرەزەی عیشق دادەنێم
لەبازگەکان پاسەوانی چاوت دەکەم
ڕۆژی دووجار داوای ناسنامەت لێدەکەم
سەرانەی ماچت  بکەم
مانگی چەند جار گومرگی لێوت دەکەم ...؟

ئەگەر بووم ،بەمامۆستا
وانەی یەکەم بەبیانووی زانستی  حەزی دڵم
دەستێ لە ئەگریجەت  دەدەم
لەوانەی بیرکاری دەپرسم لێت-:
ڕۆژی سەد کەڕەت بیرت بکەم
ڕۆژی چوارشەمەی لێ دەرچێ
مانگی چەند جار یادد دەکەم ...؟

# نائومێدی

بەو دیمەنە شاعیرێك
پالتۆکەی پڕ زەردەخەنەو
پرچی پیربووە، لە هەناسەی بەفر...!

کاتێك پڕدەبم ،لە نائومێدی ،لە بێتاقەتی
پێلاوەکانم جێ دێلم
نەکا بۆنی ویسالی تەنیایی
بگاتە مالەکەم ،لە کتێبەکان بنیشێت ...!

گەر ئەم وەرزە ئاوابووم
سۆراخی ساتی مالئاوایی مەکە
چەخار دەروازەیەك شك نابەم،بۆ هاتن
لە چاومدا ،کالٚ کالبویتەوە...!
خەزانم بووە بە مێژوو،لە ساتی هاتنتدا

هێندە دووریت لە ڕۆحمەوە
کۆلانەکانی مندالی ،
تا ئاوابوونی تەمەن بۆت بگەڕێم ناتبینمەوە...

ئەو سەردەمەی، لە کۆڵانی کوێرەوەری،بەیەك دەگەین
خێسە ،لە سێبەری یەك دەکەین
وەك هەوری بەهار بەسەردەچین
پڕ گرمە ، بێ باران تێدەپەڕین
بەئەسپای لەناخەوە دادەکەین
دەگەینە ئاستی پیری
ئەو بەسەر چوونەی لەکاڵ بوونەوەدا دەگاتە
کوچە و کۆڵانەکانی بێ مروەتی...
مەئیوسم
کە ، نەتوانم پەیکەرێك بم ،
لەشوناسی ئە باڵندانەی لەپاڵتۆی ئاسماندا باڵیان ناشت...
یان بنەماڵەی ئەو گوڵانەی
لە درزی باراندا خۆیان کوشت...!

خەیاڵ دەکەم بەووتن،شەهری دڵم

لە دامێنی ئەم ووتنەدا نزا دەکەم
خەندەیەك جەفایی دوورییە
نیوسەرنج ،دەوایە بۆ دڵ
وەرە و لە نسرمی خەیاڵم بڕوانە
شەختەیە داخ ، خەزانی ئاخ
چ ، شەرمەزاریە قەفەز

وا خەریکە مەلی دڵ بۆ دیدارت ئەدا، لە باڵ..
عیشق خۆی ئەبێ بە چیرۆك
دووری  ئەبێ بە هۆنراوە
بۆ ناتوانم لە یادی کەم ...؟
لە ترپەکانی دڵمدا چی داناوە...

نیگای ئەبێ بە مۆسیقا
پرچی خاو، بە گۆرانی
هەموویان ئەبن بە ووتن
عیشق و دووری و ترپەی دڵ و نیگاکانی...

بەڵام ، ناتوانم بینووسم
وشە ستایشی ناکا، بیرکردن و هەستەکانی
دەڕوانم ،بە خاچی پیرۆزەوە خۆمم
کە ناتوانم ،توند بیگوشم دەستەکانی

ئەوەی کە نابێ بە ووتن
نە شیرینە و نە کافرۆشی کوردانە
ئەو عیشقەی دەوایە بۆ دڵ
نە لەیل و نە زینی دەشتی بۆتانە
ئەو بڵێسەی خامۆش نابێ
نەحەبیبە و نە زولەیخای یوسفی کەنعانە

وەلیّ(وەلی دیّوانە) خۆمم
شەهرەزادیّ ویّنای (شەم)یّ بە ئاگایە لەم سوتانە
شەمیّ شەهری دلّە
عیشقە ،بلّیّسەیە ، مەرهەمی چاوی پڕ گریانە
لە پایزدا، کالّبوونەوەی ڕەنگەکانە ...؟
یان بینایی گەروی منە پڕ بووە ، لە پیّکی گریمانە...

# ماوەیەکە تووڕە دەبم

خۆم بەمن دەڵێ-:
بیرکردنەوە لە ڕابردوو دەچێتەوە سەر ڕەگی شێتی...
کەبیرت دەکەم...
قەواڵەی ئەو هەورانە دەخوێنمەوە
بە ئاسمانی هەزاران گوڵی تینودا گەشت دەکەن و
فرمێسکێ بۆ سوتان نارێژن...

نەفرەت دەکەم لەوشۆستانەی تۆ نەتناسیون،
لەوپارکانەی لەتامی پیاسەی تۆ دوورن...
بیرکردنت وام لێدەکا،
خەیاڵم پڕکەم لەفڕین
چرکەیەك بۆ ئاسمانی خەیاڵی تۆ...

دەقیقەیەك بۆ بیرکردنەوە لە ڕابردوو
شپرزەم و بەتەنافی بیرەوەرییەوە
لە خاچ دراوە ڕۆحی شەکەتم...

به یادی تۆوه
تاڵه دەزوویەکی ماوه خۆشیم
ئەم سەوداسەری توڕە بوونەم
شێتییه...
وابەستەیه بەدەوری تۆوه

ساتێك بیرکردنەوه، لـه تۆ
بەتەنافی بیرەوەریمەوه ، شپرزەیی هەڵدەواسم..
تۆ چیت ئەی مەزهەبی عیشق
بیرکردنەوه لـه تۆ،
مەوجی توڕەبوونم سەرەکا
بێ ئەشکه ڕۆحم عبور!!

# بەفر

بەفر دەڵێت :-

ئەم تابلۆیە پڕە لە خۆ کوشتن

لە وەرزی لێزمەی ناز دا پشکتووە

نۆتەی پەنجەکان بکوژی وردەنیگا

پرچ دەئالۆزکێ بە ئیلهامێکدا

سەر تاڵەکان وشەی هەڵپڕوزکاو

لەدامێنی شانەکەدا ، نیگای وەریوو

لە پەنجە و ناولەپی دا

نەرمە نیگا سەردەر ئەکا

تەناف ناز سێدارەیە

جەنابی شانۆکار...

شاعیرێك کەتنەکا، ئەم نمایشە ڕاگرە...!

# ع.ا.ش.ق.ت.م



لە شەقامی بێ تۆیدا هەڵتورتاوم

خۆم مەڵاس داوە بۆ وشە...!

ئەو پیتانەی لە گوفتاری ناشرین ون دەبن

ع، لە وشەی عینادی  قوتار دەکەم

ا ،لە ناخی ژیان دەردەکەم

ش، لە شەوگار دەفڕێنم

ق، لە قەوانی ئەو تفەنگانە دەسێنمەوە ،

کەخەوی منداڵەکان دەزڕێنن.

ت، لەسیاسەت و دەوڵەتی بێ بنەما لێدەکەمەوە

م، می هەموو یەکەم ماچەکان دەهێنم

له بناری خەمەکانتا ، له ناونهێنیەکانتدا

له ناو ئازار و بێدەنگیتدا

بەدلۆپێ له ئەشکی ڕژاوت

ئەم پیتانه پێك دێنم و ئەبنه وشه

بەتالێکی ئەگریچەتدا دێمه سەرێ و

بەئەسپای بەگوێچکەتدا ئەچرپێنم

من (عاشقتم ).

# هاوڕێ دووره وڵاته‌كه‌م



له‌م مه‌مله‌كه‌تی فڕكان فڕكانه
سوێ ده‌كه‌ینه دڵی بێده‌نگی شه‌و
غوبار و خۆڵ ڕه‌نگی ڕۆژی لێگۆڕیوین
خۆزگه‌ی حه‌زێكمان نارِوێ
بووین به‌بیابانی كاكی به كاكی
وه‌ك خۆڵه‌مێش ده‌چینه‌وه
چ ئافاتێك ڕه‌شماڵی تێكداوه
چ زریانێك به‌هاری گۆڕی به خه‌زان
پایزیش نه‌یه‌ت هه‌ڵده‌وه‌رێین...

تەماشا...

کێڵگەی دڵی مرۆڤەکان،

بوون بە پارچەیەك شەختە و

پڕمانکرد، لە تۆوی خیانەت

ئێمە براکانمان کوشت

ئێمە بەدەستی ڕاست باڵی چەپمان بڕییەوە

ئێمە پەنجەکانمان شکاند و

ئەنفالمان کرد بەقامچی و

مەیتەر ئاسا

نیشانی نەوەی دوا ڕۆژماندا

بێ ئەوەی بیکەین بەسێبەرو تیا پشو بەین...

ڕۆژانە ڕەوشت ئەنفال دەکرێ

شەوانە بیرمەند وەلا دەنرێ

لەم ، مەملەکەتی هەراجخانە

مانگانە ڕۆژەکانمان، ژیان ئەتك دەکرێ !

ئیتر بۆ بێداری ناگرین
بیٚ متمانەیی دەمامکە و
تیڕوانینمان خیانەت و
پۆشاکی بەر تریفەی مانگەشەو حەسودییە!
خۆرئاوای مرۆڤایەتیمان گوزەشت
بەقایەك نەماوە
بۆ بەرچاییەکی بەیانیانی دەستی دایك
موعجیزەیە هاوڕیٚ...
بینینی خەندەی روخساری باوك و
ڕێز لە مامۆستایەکی وانەی ئەلف و بیٚ
ئیتر ئێرە نیشتیمانە
تەماشاکە...
وەك ئاوێنەی نێو جانتای سەفەری کچەکان
دوارۆژی خۆیانی تیا نابینن ئەشکیٚ
ئێمە شکاین و ڕەوشت بوو، بە هەزاران پارچە
تەکنەلۆژیا، گەنجێتی کوشتین...!

ئەودڵەی عاشق دەبوو
لە باڵەخانەی چەپی سنگماندا
لەویێ نەما...!
لە مۆبایلی گیرفانی هەریەکێکماندایە

ئەونامەی بۆن وبەرامەی سۆز بوو
لەنێو هەزاران پەیامی درۆدایە
ئەو ئاماژەی لە ڕێگای کانی دەدوا
ئەو پیتانەی لە پیاسەیەکی چوون، بۆ زانکۆ ئەچنرا
ئەو عاشقەی تاکۆتا ڕۆژی پەیمانگا
لە شەرماندا، بۆ مەعشوقەکەی نەدوا
ئێستا،چۆتە سەر لێوی(ئیمۆجی)یەك!
ڕۆژانە جەنگی دابران و عیشق دەکات...تەماشاکە !

تەماشاکە !
نیگاکانی ئەم سەردەمە
ڕووخسار و ئەگریجەی (قژکاڵی لیۆئاڵ)
دەمامکی سناپێکە
لیوان لیوە لە درۆ
ئیتر ئەو ئاوێنەی حەقیقەتە شکا
ڕەوشت بوو بەهەزاران پارچەوە..هاوڕێ

تەماشاکە...
ئێمە لەسێبەری تۆڵەدا
دارستانەکانمان سوتاند
بێچوی لانە چێکراوەکانمان فڕاند
هێلکەی کونج کونجی پاساریەکانمان شکاند و
لە ڤیستیڤاڵی ئاشتیدا
مەع مەعەی کۆترەکانمان تاساند !

لە دوای  کوشتنی براکان
ئەوانەی چوونە هەندەران
لە ئەنفالی ویژدان ترسان
نەگەشتنە بەردەم سێدارەی خۆکوشتن
ڕەدووی سیاسەت و حزب نەکەوتن
ڕەدووی سیاسەت و حزب نەکەوتن
ئەوان لە هەموو ڕۆژێکی ئەنفال ترسان
ئەم دێڕە کۆتایی نییە...
(ئەنفالی ژیان)ی بەردەوامە

خاڵێك دابنێ و وەرەوە سەری دێڕ!
تەماشا..
کاتێ ئاسمان تورەئەبێ ئەبێ
لەنسرمی دەشتی هەپروون هەپرووني ئەم خاکەدا
لە قاقرە دارستانی ئاوەژووی تەمەندا
گەردەلوولی رقی تۆڵە،
لە دامێنی نیشتیمانەوە هەڵ ئەکا
ئیتر منیش وەك سەربازێکی دیلکراو

ڕەنگە نەتوانم...
دەواری هیچ شیعرێکی نەبیستراوم
لەم بێزارییە بپارێزم
ڕەنگە ڕەونەقی وشەم لە گۆبخا

کاتێ شوومی ڕقی منداڵێکی
بێ باوکی سەر کورسیەکی وەلانراو
لە مەوسیمی وشکە ساڵی
نیشتمانی بێ مەیتەرم هەڵدەکا
ئیتر ناتوانم...وەك نوسەرێکی لاقەکراو
وەك پێنوسی سیاسییەکی دۆڕاو
وەك سەر دێڕی ڕۆژنامەیەکی فرۆشراو
بارکە گراوندێك لە، گوڵ بنەخشێنم و
ناوی بنێم نیشتیمانی دیلکراو

ڕەنگە نەتوانم ...
بەم نابیستییە خۆم ڕابهێنم
چاوداخەم و هیچ وشەیەك نەدركێنم

كاتێ ئاسمان توڕە دەبێ
چین لەسەر چین هەوری ڕەشی خیانەت و
درۆی گەشی سەفارەت و
پێكەنینی دوو ڕوویی سۆكلانی بەیعەت و
ڕقی تورەیی گشت دڵۆپێ لەو ئاوەی، كە ڕژاندیان
لەمێژوودا منداڵەكان بۆسبەینان تێیدا گەوزان
پەردەپۆشی گرێبەستی ناوبارِ و
ڤێلاو كۆشكە بەرزەكان
پێكەنینی ئەودیو جامە تاریكەكان
ئەبێت بە تۆڵە و بە بوركان
لەم نیشتیمانە سركەدا
دەبارێت و ئەبێت بە باران...

چاویلکە ڕەشەکان و
گرێبەستی ژوورە نسرمەکان
ئەودیو جامە تاریکەکان
پڕن لە چیرۆکی نەبیستراو
سیخناخن، لە میتۆتی داهێنراو
مرۆڤە ڕۆبۆتەکانی نیشتیمان
لێوان لێون لە حیواری ناو ڕۆمانێکی وەلانراو
لە پەرتوکخانەیەکی کەڕوو لێدراو دانراون
چیدی گوێ هەڵمەخە بۆ بیستنی کارەسات
ڕوون دیارە ئێرە پڕە لە ڕوداو
پڕین لە مەرگەساتی نەخوازراو
پرین لە ئەلف و بێی نەخوێندراو.

# با ڕێنوس و خاڵبەندی بکەین بەگیروگرفت

زمـان یەکێکـە لـەو باسـانەی، کـەوا لایـەنی وردو قـوڵی تێدایە،هۆش و بیری مرۆڤ چەند بەتوانایە لە خەیاڵی ورد و تێکەڵاو و تێکئاڵاوە زمانیش ئامادەی ئەو توانایەی هەیە بۆ دروستکردنی دەستور و ڕێبازی باریك و تێکەڵاو، هەتا بتوانیّ هەست و نەست و ئەوەی لە دەروونی مرۆڤدا هەیە دەریببڕیّ، لەوەتەی مرۆڤ بووە بە خاوەن هۆش و تێگەیشتن و ئەزموونی ژیان، زمان و ئاخاوتنی زمان بەرەو گرانترین ڕۆیشتووە.

گەلێك لەنوسەرانی کورد بەزەحمەت فێری زمـانی ئـەدەبی نوسـین دەبن لایەنێکی پەسەندی نوسینی کوردی ئەوەیە ،کـە لـە شـێوازی ئاخاوتن جیا بکرێتەوە. ئەم بابەتـە زۆری بەدەمەوەهەیـە و گـەلێك گفتوگۆ هەڵدەگرێت ،لێرەدا بەشێوەیەکی کـورتبڕی و دەرخسـتنی پوختەی بابەتەکە دەخەمە ڕوو، لە لایەنی ڕاست و چەوتی دەدوێـم ،تا ڕاستکردنەوەکە بگەیەنمە خاوەن نوسینەکان.
ئەگەر شیعر یان بابەتە ئەدەبیەکە چەند بەسود بیّ پێویسـتە هـۆش و دڵ و دەروونمـان بـۆ سـوودی زمانەکـەمان بکەینـەوە ، خـۆراکی پێویسـت ببەخشـینە زمـانی کـوردی ، ئەمـەش تـەنها بـە دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی وشە نابێـت ،بـەڵکو نوسـەرانی ئێمـە زیاتر لەوە پێویسـتیان بـە پـەیڕەو کردنـی ڕێنوسـێکی دروسـت و خاڵبەندییەکی تەواوە، پێویستە نوسەرانی کـورد لایـەنی ڕێنـوس و خاڵبەندی بکەنە گرفت و بەدوای چارەسەری گونجاوی گرفتەکەدا

بگەڕێن لە قوڵایی نوسیندا بتوێنەوە گەر ناتوانن پەیڕەوی ئەو دوو لایەنە بکەن بەناچاری خۆیان دەدزنەوە.
نوسەر جگە لە ناوەڕۆك و مەبەستی نوسینەکە ،دەبێت بەهای زمانەکە دەربخات ،دەبێت ئاگاداری فۆرمی زمان بێت و خۆی لێ دەرباز بکات ،خۆ دەرباز کردنیش تەنها بە پەیڕەوکردنی ڕێزمان و ڕێنووس و خاڵبەندی دەکرێ. شیعر جەستەی مرۆڤێکە ،شیعرێکی زیندوو کامڵ واتا تەندروست و ساغی هەموو ئەندامەکانی جەستە،لەشی شیعر بریتی یە لە زمان و فۆرم و ئیستاتیکا و ئاواز و ڕەهەندەکانی، بەڵام هێشتا بەبێ پەیڕەوکردنی ڕێنوس و خاڵبەندی ئەو شیعرە هەناسە نادات ،شیعر دەبێ هەر وشەیەکی و ڕستەیەکی گیانی هەبێ و هەناسەبدات ،کامڵ بێ لەزمانە ئەدەبیەکەی.
هەرچەندە ئەم باسە زۆر هەڵدەگرێت ،شارەزایان و پسپۆڕانی زمانی کوردی زۆر لێکۆڵینەوە و شرۆڤەیان کردووە لەسەر ڕێنووسی زمانی کوردی و کێشە و گرفتەکانی هەندێ پیتی کوردی ، لێرەدا لەم پەرتووکە شیعرەدا ئاماژە بەچەند خاڵێك و ڕوونکردنەوە لەسەر ئەو هەڵانە دەکەم ، کە لەنوسینی زمانی کوردیدا دیارە و پێویستە هەڵوێستەیان لەسەر بکرێ ئەمانە چەند لایەنێکی دیاری ڕێنوسی کوردین بە کورتی ئاماژەی پێدەدەم و ڕاست و هەڵەکانی ناو ئەم پەرتووکە شیعریە دەخەمە ڕوو
١-دەسپێکی هەر وشەو ڕستەیەك بەپیتی (وو)هەڵەیە،چونکە (وو)پیتە بزوێنی
درێژە ،هیچ وشەیەك لەزمانی کوردیدا بەپیتی بزوێن دەست پێناکات،پیتی (و)ڕاسترە لە سەرەتای وشە و ڕستە ووشە---- وشە√ ووێنە----وێنە√ ووزە------وزە

٢ -بەكارهێنانی پیتی(ۆ)لەسەرەتایی وشەوە هەڵەیە ،هەر چەندە وشەی کوردیمان نییە بە (ۆ)دەست پێبکات ،بەڵام هەندێ جار وشەی بیانی بەفۆنتی کوردی دەنوسرێ وەکو وشەی work) (shopبەدەنگی (ۆ) دەخوێنرێتەوە،بەڵام بەشێوازە دروستەکەی نوسین بە (وۆرك شۆپ)دەنوسرێ.

٣-بەكارهێنانی پیتی (ی)یان (یی)،پیتی (ی)چەند ئەركێكی هەیە لەزمانی کوردیدا، من لێرەدا ئەو وشانە دەست نیشان ئەكەم كە لەناو ئەم پەرتووكە شیعریەی كاك مەریوان قەرەداخی دا هەیە و سەرنجیان ڕاكێشاوم ، وەهەروەها (ی)و(یی)زۆرجار پاشگرن و وشە دەگۆڕن بە ناوی واتایی لێرەدا بە دوو شێواز (ی)و(یی)دەناسرێنەوە،ئەگەر وشەكە كۆتایی بەپیتی (بزوێن)هاتبێ (یی)وەردەگرێ،ئەگەر بەپیتی (نەبزوێن)كۆتایی هاتبێ ئەوا(ی)وەردەگرێ ،هەروەها لەدەربڕینی كورتی و درێژیی وشەكە دەناسرێتەوە وەك ئەم وشانەی لەم پەرتووكە هەڵمبژاردووە ،نمونەی ئەو وشانەی بەپیتی نەبزوێن كۆتای هاتووە (منداڵی،كوردی،یادەوەری،بەدبختی ،بێدەنگی ،سەرمەستی دڵخۆشی،ئارامی ،گەنجی) ئەو وشانەی بەپیتی بزوێن كۆتایی هاتووە (بێ تۆیی،دووروویی،بەزەیی ،بەئەسپاییی، سەربەخۆیی،تەنیایی،بێ ئۆقرەیی،بینایی) وەهەروەها پیتی(ی)لە نێوان بەستنەوەی وشەدا و دروستكردنی فرێز و گرێ بەكاردێت بۆنمونە
(كوردی هەندەران ، منداڵی كورد، بەدبەختی من).

٤-لەکاتی دانانی ئامرازەکان لەناو ڕستەدا، ئامرازەکـان بەشـێکی سەربەخۆن لەناو زمانی کوردی و مافی خۆیانە لەنوسـیندا ئـازادبن نەك بلکێن بەپەیڤ و وشەی پێش و دوای خۆیان. ئامرازیپەیوەندی (بە ،بۆ،لە،لەگەڵ)
ئـــــامرازی لێکدەر(و،یا،یان،تا،هەتا،هـــــەتاکو ،نــــــەك، نەوەك،بەڵکو،بۆئەوەی،لەبەرئەوەی، کە، گەر،ئەگەر،
لەپاشـــاندا) بــەڵام دەبــێ لـــەدۆخی چـــەند وشـــەیەك ئاگـــاداربین ،کە(بە،لە)دەبێتـە بەشـێك لەوشـەکە و وشـەیەکی تـازە دروسـت دەکات پێی دەگـوترێ پێشـگر وەکـو: (بەخۆشـی، بەئاسـودەیی، بـــــەناز، بــــــەپێ ، بەپەلــــــە، بەتـــــەنیا بەگوڕ،لـــــەناو ،لەنزیك،لەدواییدا،لێرەدا،لەوێ،لەبرسا،سەرلەنوێ،لەیادکردن... هتد) بەڵام لەم ڕستانەدا ئامرازەکان سەربەخۆ دەنوسرێن و پێویستە لەپێش و لەدوای بۆشایی(spaes)هەبێت وەك ئەم چەند نمونـە:– شیعرێکم بۆ عیشقی دایکم نوسی. نامەیەکم بە بای شەماڵدا نـارد. ڕابردووم پڕە لە تۆ. هێندەی چاوەڕوانی بیابان بۆ باران . نالەباری لێوان لێوە لە من. من و تۆ. نغرۆم و سەودا سەرمە بۆ بینینت.

٥-لە زمانی کوردیدا سێ جۆر وشە هەیە لەڕووی داڕشتنەوە ،جـا لەهـــەر بەشـــێکی ئاخاوتنـــدا بێت(ناو،ئاوەڵناو،ئاوەڵکـــار یـــان چاووگ)ئەم بەشانە سادەو داڕێژراو و لێکـدراویان هەیـە، نوسـەر دەبێت ڕەچاوی دروستنوسی ئەم پەیڤانەی زمـانی کـوردی بکـات ،کە وشەی داڕێژراو لێکدراوی بەر چـاو کـەوت پێویسـتە بەسـەر یەکەوە بینوسێ ،چونکە وشەیەکی تازە لە ڕووی واتـاو داڕشـتنەوە

دروست بووه ،ئەگەر بۆشایی بخەیتە نێوان دووبەشەکە ئەوا دەبێت بەهەڵەیەکی ڕێزمانی بۆنمونە ئەمانە لەڕوی ڕێزمـان و دارشـتنەوەی هەڵەن دروستەکەی لەتەنیشتی دا یە

-:چاوەشارکێ مان کرد ---چاوەشارکێمان کرد

نوێ کردنەوە --نوێکردنەوە

بێ دەنگی --بێدەنگی

مەڵاسی داوە--مەڵاسیداوە

جێ بهێڵێ--جێبهێڵێ

تێ پەڕی --تێپەڕی

دەست پێکرد --دەستپێکرد

هەڵ وەرین --هەڵوەرین

دەنگ دان --دەنگدان

٦-سـەبارەت بـە بـەکارهێنانی خاڵبەنـدی ، بابـەتێکی گـرنگ و بەرچاوە لەنوسینی زمـانی کوردیـدا پێویسـتە بـەوردی و دروسـتی ڕەچاوی خاڵبەندی بکرێـت ،هەرچـەندە لـەژانری شـیعردا کـەمتر لایەنی خاڵبەندی پێویسـتە کـەمتر دەر ئەکـەوێت ،لێـرەدا بەچـەند خاڵێك و بەکورتی و پوخت لەو بارەیـەوە دەدوێـم . --خاڵبەنـدی دانانی نیشانە یان خاڵە لەنێوان بەشەکانی ئاخاوتن لەکاتی نوسـیندا ،خاڵبەنـدی پەیوەنـدی گـرنگ و بـەهێزی هەیـە بـۆ بەسـتنەوەی بەشەکانی ئاخاوتن. لەڕستەیەکی سـادەی وەك و (تۆشـاعیریت)ئەم ڕستەیە لەکاتی دەربڕین ئاوازی دەنگیدا دەتوانرێ جۆری ڕسـتەکە جیا بکرێتەوە،بەڵام لەنوسیندا پێویستی بە دانانی نیشانەیە-:

تۆ شاعیریت. ----- ڕستەی هەواڵی یە

تۆ شاعیریت ؟------ ڕستەی پرسیاری یە
تۆ شاعیریت ! ------ ڕستەی سەرسوڕمانە
دانانی نیشانەکان سەرتاپای ڕستەکەی گۆڕی و خوێنەر بەباشی لێی تێدەگات.

٧-نیشانەکانی خاڵبەندی، ئەوانەی زۆر گرنگن-:

١-خاڵ(.) وەستانێکی تەواوە لەکۆتایی هەر ڕستەیەکدا ، وەهەروەها لەکورتکردنەوەی هەندێ پیشەو نازناو یان پیتی یەکەمی ناوێك کەپێش ناوی خێزانیان بکەوێت بۆنمونە:

مامۆستا ڕەوەند ----- م.ڕەوەند
دکتۆر عەلی وەردی --- د. عەلی وەردی

٢-جووت خاڵ(:) بۆکانی ئاخاوتن وەکو (ئەو گوتی: یان من ئەڵێم : نمونە هێنانەوە بۆ باسێك یان ڕاڤەیەك ئەم نیشانەی جووت خاڵەی دەوێت وەك بۆ نمونە:

لە نێوان کاتەکانی کاتژمێردا ١٢:٣٠ خولەك

٣-بۆر(،)وەستان و پشویەکی کورتە ،بەکارهێنانی لەزۆر شوێندا دەردەکەوێ لەدوای گرێ،ناوی بانگکراو ،لە نێوان ژماردنی زنجیرەیەك وشە لەدوای وشەی بەڵێ و نەخێر،هەندێ جار لەنێوان دوو ڕستەدا بەکاردێت لەجێی ئامرازی لێکدراو.

٤-بۆر و خاڵ(؛)یان خاڵبۆر وچانێکی درێژترە لە(،)بۆر ی سادە،لەنێوان کۆمەڵێ ڕستە بەکاردێ ،کە پەیوەندیەکی توند و تۆڵیان پێکەوە هەیە.

٥-نیشانەی پرس (؟)بۆ پرسیار کردن لە ڕستەیەکی پرسیاری بەئاوازی دەنگی دەردەبردرێ ،یان پرسیار کردن لەکات و شوێن

و چۆنیەتی و چەندێتی بۆنمونە: ئەو ژنانەی نەیانزانی بۆ کوژران؟ تۆ بڕوانە نەوت چی لێکردین؟ چی پێکردین؟
٦-نیشانەی سەر سەرمان(!) بۆ کۆتایی ڕستەو حاڵەتی سەرسوڕمان بەکاردێت جا ڕستەی خۆشی بێت،یان ناخۆشی.
٧-جووت کەوانەی بچوك « » بەکاردێت بۆ گرنگیدان بە وشەیەك یان وتارێك یان ڕستەیەك یان گوزارشت لەشتێك
داپیرەم ئەیگووت:
((ڕێوی لەکونی خۆی هەڵگەڕێتەوە ،گەڕ دەبێت)).

٨ -جووت کەوانەی گەورە ( ) بەکاردێت بۆ ڕوونکردنەوە و دەرخستنی واتای وشەی پێش کەوانەکە وەك وشەیەکی بێگانە یان بۆ بەکارهێنانی ژمارە وەك ساڵ سیاسەتی مۆدێرن(تۆتالیتاریزم )

٩-هێڵ یان تەقەڵ (–) لەدوایین ڕیزبەندی ژمارە ،بۆ جیاکردنەوەی گفتوگۆ ،بۆ تەواو کردنی وشەیەکی تەواو نەکراو لەکۆتای دێڕ دادەنرێ.

١٠ -سێ خاڵ(...)لەکۆتایی و ناوهێنانی کۆمەڵێ وشە بەدوای یەکدا، بۆ تەواو نەکردن و کۆتایی نەهاتنی ڕستە.
١١ -ئەستێرە (*) بۆ ڕوونکردنەوەی وشەیەك یان ڕستەیەك لە پەراوێزدا، بۆ بەکار هێنانی ڕستەیەکی نارێزمانی.

١٢-بۆشای (spaes) گرنگترین لایـەنی بـەکارهێنانی ڕێنـوس و خالّبەندی لـەنێوان هەر وشەو لـێدوان و پەیڤێك و ئامرازێ پێویسـتە دابنرێ

١٣-هێڵی لار(/,\)بۆ نوسینی بەروار یان بۆ دابەش کردنی (بڕ،کات،سالّ )دادەنرێت.

تێبینی / لـەدوای نیشانەی (.) خـالّ ، بـۆر ، بۆرخـالّ ، جووتخـالّ ، سەسوڕمان ، پرسیار ، هێڵـی لار دەبـێ سـپەیس هـەبێت ، ئینجـا وشەی دواتر بنووسرێ.

م. ڕەوەند صالّح حەسەن

# ئاوێنە



تا،ئەستێرە کشانی بەختم
تا ، ئاوابوونم بێدەنگ بە
تا،کەوتنی من لەدڵتا
تا، هەڵوەرینت لەدڵما
شەهری دڵم بێدەنگ بە
بەفری سەرم هێواش هێواش
لە بێدەنگی دا دەبارێ

باران نم نم لەگەڵ(با)دا،
...تیانوسی بیرکردنت ئەماڵێ
بێدەنگیت پڕ بووە، لە ووتن
بە حونجە هەستەکانت دەخوێنمەوە

جارانا جاریّ
بۆ سوتانم بەنامەیەك پشكۆی ناخم گەش كەرەوە
تۆ،تەنها پرسیاریّ بكە
با وەڵامەكەی نەزانم
پرسیارێكی بیّ وەڵام بیّ...
بۆ ساڵێك تیماری دەردە،چەند یادگارە
پرسیارێكت میوانم بیّ ،لە دڵمابیّ

بێدەنگیت دەمكوژیّ !
لەم شیعرەدا هەست بە هەڵوەرینم ناكەی..
نزادەكەم، لەیادت كەم
لەیادناچی...!
بەچی لەبیر دەچیتەووە
خۆت شتێكم پیّبڵیّ...؟

# باڵندەی سرکـ شوناسـی قـەفـەس نییـە ...!



لە دێڕێکا شاراوە دەتشارمەوە
کەچی تۆ لە پشت شاراوەکانەوە
چاوە شارکێ دەکەیت...
لەدەلاقەی گیانەوە دزە دەکەیت و
تیرۆژ لەچاوەکانما سەوزن
هۆنینەوەی ئەم پیتە ملوانکەیە
سەدەیەکی دەوێ تەزبێحی لێ چێکەی
شەپەنگی وونبوو لەبەختی من ...!

ئازارەکانی دەوری بێدەنگی هاوڕێمن
خەیاڵەکانی نێو بێدەنگی بوونە خولیام
شیکاری بێدەنگیم کرد
تەنیایی شپرزەی کردووم!
وەك ئەو مرۆڤەی هەمیشە پێدەکەنێت و
عەمبارێکە لە غەم
وەك ئەو سەربازە هەڵهاتووەی جەنگ
بە خۆی دەڵێ:- نەکوژرام و
خەڵکیش پێی دەڵێ:- بوو بە پاڵەوان
بەڵام،ئەوەی لە بێدەنگی تۆدایە منم
ئەوەی لەتەنیشت دڵت دایە
لەسەر ئاوێنە و ناو پۆشاك و
هەناسە و سەر سەرین و
لە نێو شەوگاری تەنیاتایە..منم

ئەوە گیانی عاشقێکە بۆنی هەناسەت دەکا
بەئەسپایی پرچی خاوت شانە دەکا
ئەوەمنم خەندەی لێو،
خۆشیەکانم سپی پۆش کردی
لە دنیای بێدەنگیتدا تەنیات کردم و
بە ئەسپایی ڕۆشتی...!

# سپیستان



سپیستانە ئەم نالّینە
لە وەرزی بەختی ڕەشمدا
لەدوا نەفەسی بە هاردا سپیستانێك هات
نە،لە گولّ چوو نە،لە بەهار
نە ئاوازی مەلەکان و نە لە دەنگوباسی کۆرۆنا...
موژدەی نێرگزی هێنا بەدەم هەلّالّەی گولّەوە
کە،هات سپی ئاسا
وەك شوێن پێی بەفر ئەو هات بەڕەنگی سپییەوە
بە لۆژیکی سپییەوە بە زیکری سپییەوە
ئەو پەری ئاسا بە ئالّ و بالّای سەریەوە
سپی سپی بەلّام، نزیك لە فریشتەکان
ئەو کچی سپیستان بوو...!

نزيك لە ئايەتەكانی پاكيزەيی ئەو كچ بوو
لە ڕۆژهەڵاتی خەونەوە سپی گوزەردەكا
لێ حەپەساوترين مەعشوق بووم لەبەختی سپيستان
تەمەنێ لە كچێتی وەك باڵای دار بەڕوو
پشوو درێژ بۆ ڕاڤەكردنی سپيستان
لە (ئەلف)ی تەمەنەوە تا(ی)ی كۆتايی
قەڕنێكی دەوێ نەك وەرزێكی خەمناك
بۆ پێكێ لە نۆشينی سپيستان...
سەردەمێك دەمزانی سپی،
سپی ژيان بەرێ دەكا
وەلێ درەنگ زانيم چ، سپيستانێكە
لە هزرما عەجەب تێگەشتن
لە سپێتی تەمەنی نووحی دەوێ نەك سەردەمی كۆرۆنا...!

# نمـەی باران
# لـە زاری شـەهرەزاد



وێنەیەکم بۆ بنێرە
وێنەی گەرمی نیگا و
دوو لێوی تەڕ و بریقەدار
یان وێنەی ئەو لانسرمانەی لەشت
مووی ڕەش و زبریان لێ دەڕوێ
لەپی دەستەکانم دەخەنە پێکەنین و
نیگاکانم پێیان دەڵێت:-
زیاتر لە باوەشم بگرە بالەدووریت ڕۆحم نەفڕێ

وێنەیەکم بۆ بنێرە  پەنجەکانم گەرم بکەن
کاتێ لەئامێزی دەگرم
وێنەی برژانگ و چاولێکنان
وەك نیشانەی ئاوێتەبوون
توانەوە لە لێوان و لیکرژانی شیلەی دەمان

وێنەی لێدانی دڵت، توند و بە هێز
وێنەی فەرهادێکی  خۆڕاگر پڕ لە هێز
وێنەی  هەستی پڕ لە نەست
کە،خەمی منیان هەڵگرتووە
کە،نیگامی تیا ڕۆچووە
جارێکی تر
بچمەوە بەر ئاوێنە و بۆ ژوانێ پرچەکانم
خۆی ڕێك بخا...!
جارێکی تر چاوەکانم کل ڕێژ بکەم
جوانیی ئەو لێوە ئاڵانەم
لە شووشەی شەرابی درزتێبودا ڕەنگ بکا

وێنەیەکی تەلیسماوی دوور لە سەراب
بەشی ئەو شەوانەم بکا
خەونت پێوە ببینم و
سپێدان بەخەندەوە، پۆشاکێ بپۆشم
پڕبێ لە نیگای جوانت
ئەفسوس، بۆ خەونی سەراب و کاتەکانی ڕاموسان
لەسەر چیایی بێ ئومێدی ڕادەوەستین
پێکەوە،لە سروشت دەڕوانین
توند یەك لە ئامێز دەگرین
بۆنی وەرزێکی نوێمان لێدێ
بۆنی سەوزی هەستی دڵ و ڕۆح تیا بفڕێ

وێنەیەکم بۆ بنێرە ...
وێنەی دڵ لەرزین و پەنجە گوشین
ساتی کردنەوەی یەخە و لێو مژین
وێنەی نیگاو ماچێکی ڕادەستی سروشت
کە،دەینێریت و زۆر دەترسی بە، من ناگا
یان وێنەی لێکردنەوەی گوڵێك
بە بەرتەقایی بۆنی منی لێدێ

وێنەی ئەو کاڵاّیانەم بۆ بنێرە
کە ڕەنگی پێستی تۆیان گرتووە
یان پشتێنی کەمەر و وابەستەی هەستی ڕۆژانە
بۆ دیداریان وەکو مەلی تینوون هەستەکانم

وێنەیەکم بۆ بنێرە
خواستی خۆشەویستی بێ
کە پێم بڵێ-:
هێندەی خۆشەویستی
منت خۆش دەوێ
وێنەیەکی وا بنێرە موعجیزەبێت
دەریایەك بێت لە وشەو
لێوان لێو بێ ،لە وەرزی ناز
پڕبێ لە گوڵی شەوبۆو نازناز

# ئەم خاکە هێ ڕووان نییە،
# نزای بارانێ بۆ مەکە



خاکی دڵم،هێزی نەماوە ،بۆ ڕووان

گوڵ و چیمەن و ئاوەنیا

سوتا بەئاهی دیدارت ،هەڵبڕوسکا

بە، باران بڵێن نەبارێ

سوچی نی یە ، لە هەردی کاکی بە کاکی

کە،تیا نەبێ بنجێ گیا

تیا ناسرەوێ نەشئە گوڵێ

لە دووری هەڵاڵەی داوە بە (با)دا

بای حەز گڤەی بێت یاخود نا
وەکو یەکە، لە بیابانی بێ دەواردا
ئەو ئاهەم چوو، کاتێ وشەم بە بێدەنگیدا چزا
داخی پڕ ئاخی دا بە دڵ ووتی دێم و نەهاتنی بە من دا
تەوافی دەستیم ، لە کیس چوو
کە ، دەستی هێنا،بە جارێ ڕۆحم تیا دانا

بباری یان نەبارێ مێخی نە کوتا ،لە دڵدا
بێ پیتی یە ، یان بێ پێزی تۆوە، لە خاکدا
وەکو گەنمە لە هەویردا یان ئاوی زۆرە،لە خاکی لێژدا
بە هەور بڵێن دانەکا
نمەیەکی نمەیك ڕوخسارم گەش ناکا
لە وەردی خاکی دڵم
بێ مەیلی ئەوە تۆوی حەزی، تیا ناڕوێ
بچکێ گیا سەر دەرناکا...!

# ئەی ژن



ئەگەر گۆرانی بێژ بومایە
پڕ بە دەنگ هاوارم دەکرد
هەموو ڕۆژەکانی ساڵ خۆشم دەوێی
ئەگەر نەورەس بوومایە
لە کەناری دەریایی دڵت
ئارەزوی فڕینم دەکرد و
ئاوازی عەشقم بۆ دەخوێندی
تا قوڵای دڵی ئاسمان پەی پێبەرێ
خۆشم ئەوێێ
بەدەستم بوایە، لەم ڕۆژەدا
بێدەنگیم ئەکردە ئامانج،بۆ زمانی تیژی
ئەو نێرینانەی بەشمشێری پیاو سالاری
قەڵای حەز و خۆشەویستیت زامداری دەکەن

جوان  بەخشی باخچەی  ژیان
چونکە ،تۆی ژن چەشنی گولێت
لەبەر ئەوە، خۆشم دەوێی

بە پایزدا تێپەڕ بووم
دارەکان پێئەکەنین
بەگێڕانەوەی سەرگوشتەی(با)
گەڵاکانیان هـەلئەوەری
بۆ ئەو ژنانەی نەیانزانی بۆ..کوژران ؟

بە شەختە،وەرزیێ گوزەشتم کرد
لە ناو دڵی بەختی بەفرا
بێدەنگی خۆی حەشار داوە !
کاتیێ شار سپی ئەپۆشیێ
هێواش  هێواش دەکەومەڕیێ...

بەمیوانی چوومە خزمەت کلوی بەفر
نزای بێدەنگی ژن بوو
مەراقم کرد
پەنجەکانم هـەڵوەری !

پەرتوکی بێ دەنگی ژنێکم هەڵدایەوە
بەدیار مۆمی تەمەنییەوە
بەجووت گریاین
شەو تێپەڕی،پێش سپێدە
بەیەکەوە کز دەسوتاین...

لەتەنیشت
فرمێسکەکانی دایکم خۆم هەڵخست
لەبێ دەنگی ژن گەیشتم !

بە شەقامەکاندا
بەناو ڕۆبۆتەکانی شاری مەنفا گوزەرم کرد
بێدەنگی ژن پەلکێشی کردم..
چوومە دیداری
مەراقی پێناساندم !

لە ناو باخچەی دڵی ژنێك سەفەرم كرد
پەرژینی كلتور دیلی كردم
نێرینەیەك گەرووی گرتم
چوومە شەپەنگی چاوی
ماڵئاوایی پێناساندم
كە،ئازارەكانی دا بە(با)
هێواش ..هێواش هەڵوەریم...

گەشتمە گەڕەكی منداڵی
بە ئەسپایی...
لە دەفتەری یادەوەریەكانم چوومە ژوور
پیتەكانی دەوری بێدەنگیم هەڵفڕاند
شوشەی پەنجەرەیەكی بێدەنگیم شكاند
ئەوەی تاساندمی فرمێسكەكانی دایكم و
دنیای بێ دەنگی خوشكەكەم و
قاقای دڵی خەمباری براكەم و
زەردەخەنەی باوكم بوو
دنیای بێدەنگی...عەمبارێ لە خەم !

له نیشتمانی وه‌لانراودا
باخچه‌یه‌ك له ڕه‌نگی ژن پێ ده‌زانم
پڕه له گه‌ردی بێده‌نگی كوژراو
له مه‌مله‌كه‌تی فه‌نا بوندا...

په‌پووله تیا نافڕێ
بولبول تیا ناچڕێ،چێ ناكا
گوڵه‌كان خۆیان ڕووت ده‌كه‌نه‌وه به بێده‌نگی
گه‌ڵای دره‌خته‌كان هه‌ڵده‌وه‌رێن به بێده‌نگی
بێده‌نگی ئاوێزانی مێژوویان بوون !
هه‌راسانی بێ ڕه‌وشتی بوون ، به‌حه‌زی
چڵكنی داوێنی ئه‌و مرۆڤانه‌ی به ده‌ست نوێژه‌وه
چونه فه‌توایی هه‌ڵپاچینی خه‌ونه‌كانیان
ژن كوژه‌كانی نیشتیمان !

# وشە لەبیرنەکراوەکانی ساڵ
# بە کاتی منداڵی



نامەویٚ بچمەوە کۆڵانەکانی منداڵی

بەڵام...

ئەم وشانە هەرگیز،لەبیر نەچوونەوە

سەر ڕێژ بوون ،لەجەنگ..

جەنگی فاو (حب الوطن)ساڵی ١٩٨٢

.کلیلی(بەهەشت)

.جەنگی (قادسیە)

تانك ،فیراریی،موخەریب،جەلالی ومەلایی ساڵی ١٩٨٦

.مستەشار

.دفتر(الخدمە)

ئەلف و بیّ ی وێرانکاری کیمیایی- ئەنفال ساڵی ١٩٨٨

.هەڵەبجە،پاسدار

.گەرمیان،مستەشار

ئازادی (ڕا)(پەڕین) ساڵی ١٩٩٠

.سەوز و زەرد

.فەرهودی

ڕاکردن  وێرانی مایەپوچی لەژیان ساڵی ١٩٩١
.نان،پەتاتە،یوئێن
.دووئاو،مەرز

ڕووانی تۆوی خیانەت مەخسەرەی سەگ ساڵی ١٩٩٤
.شەڕە پەڕۆ
.کەماندۆ

ئیجە و هەندەران ،هەڵهاتن ساڵی ١٩٩٥
.جەندرمە،یۆنان
.قاچاخچی

براکوژی جاشی کلك سەوز ،جاشی کلك زەرد ساڵی ١٩٩٦
.هەیبەت سوڵتان،دێگەڵە
.تانك و تەیارە

وشەی (ئاپۆ)و شتی تریش...ساڵی  ١٩٩٨
.قەندیل
.پەکك

جوندل ئیسلام ئەنسار سالّی ٢٠٠١

.خێڵی (حەمە)

تەیحان ،علوج ،جۆرج بوش، سالّی ٢٠٠٣

.دۆلار

.هێزی ئارئارِ

نەوت نەوت نەوت ئۆپیك سالّی ٢٠٠٨

.تەنکەر،بیر

.سۆرانی مامەحەمە

سیاسەتی مۆدێرنە(تۆتالیتاریانزم)سالّی ٢٠١٠

.سەوز و زەرد

.سەردەشت عوسمان

(ارحل)،رێژوان ،بەرد بە فیشەك سالّی ٢٠١١

.ئەی گۆڕین

.دەنگدان

.کاوە گەرمیانی

.گەواد

(داعش) ڤیژەی کچەکانی شەنگال ساڵی ٢٠١٤

.ژن ،بەرخۆدان

.ئەبوبەکر بغدادی

ریفراندۆم ،شەهید هەژار ،کرکوك ساڵی ٢٠١٦

.چەکی(میلانۆ)

.بەڵێ،نەخێر

.وداد حسین

کورسی ،شەڕی نان ،گەندەڵی ساڵی ٢٠١٧

.سازان

.کردار شەرتە

مووچە،داهات،پاشەکەوت، ساڵی ٢٠١٨

.بغداد موفلیسە

.ئیرهابی فیکری

داهاتی ڕۆژنامەگەری کورد ساڵی ٢٠١٩
.ڕێنماییەکانی فرهاد پربال
.پێنوسی نووسەری فرۆشراو

کۆرۆنا ، مووچە ساڵی ٢٠٢٠
.کەرەنتینە،ئۆنلاین
.داخستنی پەرستگاکان

ئەمەوێ شتێ بلێم...!!!
نا هیچ نالێم،
نەبا ئەم بێدەنگییە،لەبار بچێ...

# نامەی یەکەم



سڵاوێك پڕبێت لە بۆنی میسکی ئەو گوڵانەی بۆ دیداری وەرزێکی نویێ لە من زیاتر چاوەڕوانن،سڵاوێك ڕەنگی تۆختربێت، لەو گوڵاڵە سورانەی بۆ یەکەم ڕۆژی بەهار حەیرانی خوایە وەتەن ئاواکەی دەچڕن،گەرم و گوڕ تربێت ،لە مەراقی ئەو لاوانەی لەڕەشبەڵەکی حەوت ڕۆژ و حەوت شەوی ئاهەنگی کچ و کوڕێکی عاشقی نێو گوندەکەیاندا هەڵدەپەڕن ،
لەوەش زیاتر ..سڵاو بە نەغمەی ئەو مەلانەی بۆ فڕگەی کانیاوەکانی زستان و نسرمی بنار چیاکان، لە گزنگەوە گۆرانی دەچڕن ، دەمەویێ مەراقی بێدەنگیت ئاوێزانی بەفری لوتکەی

چیاکان بکەیت و لە ئیستاوە بتوێنەوە ،بەتینی گەرمی ئەم عیشقە وەلانراوەی دڵی من...!
دەمەوێ وەرزی شەختەی بێداری هەستت بە هەناسە ساردەکانی من و گەرمی بلێسەی تیشکی چاوەکانت بتوێنەوەو بچنەوە سەر ڕیتمی شوێن پێکانی کانییەکی بنار چیا و دیدار بۆ پۆلێك مەلی دڵشکاو سازبکەن ،
لە یەکەم ڕۆژی بەهاردا،وەك هەمیشە لەگەڵ کلێپەی ئاگری نەورۆز بەر لەئاوابونی بلێسەو بێ بە خۆڵی ژێر پێکانت وەك سەرنجە خەماویەکانی من ،ڕێچکەی گەرمی گەشتیارانی ئەم دەڤەرە بۆ دیدەنی بەهارێکی پڕ لە گوڵ تاو دەسێنێ.
منیش لەگەڵ هاوڕێ دڵشکاوەکانمدا ،ڕوو دەکەینە سروشتی جوانی عاشقانەی قەشقۆڵی و هەر لەوێ بەدەنگی بەرز ،
بەڵێ.. زۆر بەرز.. گۆرانی بێ تۆی ئەڵێم ..هەر لەوێ پێکی شەرابی بێ تۆی ئەنۆشم ئاخر ئەوان حەزیان لەدیداری شاخ و داربەڕووەکانی قەرەداخەو منیش چیرۆکی نائومێدیم ،بۆ تافەی ئاو باس دەکەم ،ئیتر دڵم ناشکێنن ،وەك ورینەیەکی بێ ئاگا دەڵێن :وادیارە ئەم عاشقە دڵشکاوە خەونی بەشەهرەزادەوە بینیوە،
دەیەوێ بۆ ئاوی بگێڕێتەوە، تا سێبەری کەناری چۆمی ئاوی دووکان ناوەستن و هەر لە ڕێگاش ئەوگۆرانیانەم بۆدەڵێن کە تۆ حەزت پێیان دەکرد،
ئەوان بەدەنگی دەهۆڵ بە گوێ گرتن لە گۆرانی؛-

(کەی دێتەوە ،کەی دێتەوە، لەدەستم چوو تازە ڕۆی نایەتەوە)پێك لەدوای پێك هەڵدەدەن و بۆ بیٚ ئومێدی ژیان دەنۆشن ،
منیش بە خەیاڵی چاوەمەستەکانت نیگایی سحراوی و خەندەکانت پێکی خەیاڵە ئاڵۆزەکانت لیٚ دەدەم ، لێو دەنێم بە سەرابی نیگاکانتەوەو ڕازی نێوانمان بۆ ئاو دەگێڕمەوە، تەنها ئاو توانایی بیستنی ئەم چیرۆکەی نێوانمانی هەیەو ئاو هێزی وەرگرتنی ڕازەکانی دڵی منی هەیە ، تافی ئاو ئەتوانیٚ پریاسکەی خەیاڵم ڕادەستی دەریا بکات و بەشەپۆلێکدا بیگەیەنێتە کەناری دڵنیایی، ئەم بەیانیە زۆر جیاوازتر پەپولەکانی باخچەی ئەوین ، دامێنی خەیاڵی گرتووم چوونە سەر پلیکانەی غرور و بەر لە سپێدە هاتوون،لەگزنگەوە مەراقی دیداری تۆیانە!...
چلۆن من عاشقی تۆم ،ئاوا بەهاریان خۆشەویٚ لەیەکەم وەرزی گوڵ و دیداری دڵ.

شەهرەزادگیان...لە وەرزی بیٚ تۆی دا،چۆن وەڵامی پەپولەو دیداری گوڵی ئەم وەرزە بدەمەوە، کە چاوەروانی عەیامێکە ،بۆپرسیار گەلێکم هەڵداوە و دەمەویٚ بەتەنافی نێوانماندا بەرگی نائومێدی بدەم بەدەم باوە ،
شەهرەزاد گیان دەمەوێت تەواویی هەموو گوڵەکانی نەوبەهار و ووردە بەردی پڕ میحنەتی کانیاوە عاشقەکان و چرۆی داری چیاکان پیٚ بزانن خۆشم دەوێی.

دەمــــەوێ ســــپێدەیەك لەگــــەڵ تیشــــكی هــــەتاودا پــــەیامی خۆشەویستیت بـدەم بەتـەواوی هـەموو گیانـداران و لـە ئاسمـانی سـامالێكدا پەخشـی بكـەم ،بلـێم ئـاوا وەك خۆشەویسـتی ئێمـە یەكترتان خۆش بوێ.

دەمەوێ خۆشەویستیمان بچێتە نێو جەنگەكان بچێتە ناخی تـەواویی مرۆڤایەتی و نێو كوشتن و لە ناو بردن و قڕ كردن و نێو ئەستێرە و لای مانگ و هەموو ئاسمانەكان ،

پێیان بلێم چۆن شەهرەزادم خۆش دەوێ ئێوەش ئاوا خۆشەویسـتی بچێنن و بیچننەوەو خۆشەویستی ببەخشنەوە..

سوێندت بۆ ئـەخۆم بـەو گیانانـەی دەیـان بیـنم و ئەوانەشـی نـەم بینیون،بەوخەونانەی دەبنەڕاستی و ئەوانەش بـوون بەسـەراب و لـە دامـێنی خـەیاڵێكی جـوان قـەتیس مـاون و بێـدەنگی بـە دنیـادا دەبەخشنەوە،

سوێندت بۆ دەخـۆم بـەو چـاوانەی ڕەنگـەكانی ژیـانم بـۆ جـودا دەكاتەوە و بـە و تامانـەی چـێژەكان و تـەواوی تـاڵی ژیـانی پـێ دەنۆشم بە هەزاران وشەی تێكشكاوی سەرنجی بینایم ،

بە سەدان ڕازی نەوتراوی گەرووی قەتیسماوم خۆشم ئەوێی.

دەمەوێ بێدەنگی یەكان شی بكەمەوەو پیت بەپیت پـەیامی جـوانی بدەم لە یەخەیان پەیامی خۆش ویستن ،

پیرۆزبای بەهارێكی نوێت لێ دەكەم ،پیرۆزبایی وەرزێكی نـوێی ی تەمەنت لێ دەكەم ،داوادەكەم تەمەنت هێندەی خۆشەویستی مـن و

چاوەڕوانی من و تەواوی ئەستێرەکانی ئاسمانی بێداری درێژ بێت ،و وەرزی بەهار بەخوشەویستی تۆوە جوانتر و جـوانتر دەبێت،چـونکە بەوبرینـەی ناخمـەوە تـۆم لـە خۆشەویسـتی زیـاتر خۆشـتر ئـەوێت شەهرەزاد گیان...

# بـەيانـے باش



زۆر ماندووم...

شەرحی بۆردی تەنیایم پیّ ناکریّ

بیّداریم تاقەت پڕوکیّنە و

سروشتی بیّدەنگیم !

چەتری بۆ نابیستیم هەڵداوە

تۆش چاوەڕوانی بۆ تەنیایم مەدوورە

لە گزنگەوە...

بۆ پەرژینی باخچەکەتان دەڕوانم

لەپیّش پاساریەکانەوە

وجودم وەك پەیکەریّك چاوەڕوانە!

گوڵم هەستە پەنجەرەکە بتازیّنە...

بە نیگایەك بم دویّنە

هەستە گوڵم...
خۆر چاوەڕێی دیداری تۆ دەکا
وابڕیارە تۆنەبینێ
واژوو لەسەر هیچ نیگایەکی ترنەکا
لێی بڕوانە بەردەم دەرگا و ناوکۆشکەکان
باڵەخانە و سەرئاوێنە و گەڵای وشکی درەختەکان
ماتەم ئەگێڕێ بۆ ئاسمان
پڕ بوون لە مەراق لێوان لێون لە غەمباری
گەردون پڕە لەبارینی نزای عاشقەکان
پڕە لەو دووعایانەی نەگەشتنە لای خودا
پڕ بووە لە ماتەمی ئەو فرمێسکانەی
زەمانێکە قەتیس ماون
پڕ بووە لەئاهی ساردی
ئەو فەرهادانەی بە خەیاڵی شیرینەوە
جەستە زیندون ژیان دەکەن

پڕ بووە...
لە چاوەڕوانی کراسێکی بووکێنی دوایی ئەنفال
پڕە...لە گەڕیدەی عیشقێکی لەدەست چوو
پڕە... لە ئازاری منداڵەکانی دوای عەرعەر

پڕن لە هەزاران چیرۆکی نەبیستراوی کچەکان شەنگال
پڕن لەخەونی ئەو منداڵانەی لە ئیجە خنکان
پڕن لە خەندەی هەنارێکی تاساوی هەڵەبجە و
پڕن لەغوربەتی سەحرای حیجاز و
پڕە لە گەردی بێدەنگی ژنێکی کوژراو
لە مەملەکەتی فەنا بوندا...
تو ئەو جوانیەی هێناتیە بوون
بە نیگایەك خۆر بدوێنە
هەستە گوڵم پەنجەرەکە بتازێنە...
دڵم پڕ ئاهوو برینە
هەستە بڵێ : بەیانی باش
خاوەن دڵی وردو خاش

لێی بڕوانە ...
خۆر لە مەراقدا وا دەخنکێ
قاقرە یەکین , لە بێدەنگی
ئەویش وەك من ، چاوەڕوانی نیگای تۆیە
زەوی کش و مات دنیایەکی بێ تام و بۆیە
چاوکاڵەکەم هەستە لە خەو
ئەوینی من، سارێژی دڵی وردو خاش
هەستە لەخەو تاپێت بڵێم بەیانیت باش

هەستە وەك من تەماشاکە دنیایی جوانی ژین ببینە
بەنازەوە لێ بڕوانە دنیای پڕ ئەوین ببینە

خەیاڵم بۆتە ئەسپەشێ لەم جەنجاڵی بەو بەختیە
چلۆن بدوێم ڕاناوەستێ چارە چی یە
هە ستە بزانە چۆن ئەدوێم
بە تاسەوە وێنای جوانی،وەك باڵداری پاڵی نزار
وێنای خەزان و بێ باکی نیگای ناکامی دڵ بیمار
هەستەو بلێ بەیانیت باش
خاوەن دڵێکی وردوخاش

شەهری دڵم
سپێدەی شیعرێکی تەڕ
هەوێنی ئیلهامی جوانی
نازەنین وەهمی خەیاڵ
گزنگی سپێدەی بەیانی
تەماشاکە...
دڵ لەسینەم گوزەردەکا
بۆهیلالی چاوی کاڵت
ڕۆح،لە لاشەم دەردەکا
بۆ بینینی ڕوخساری تۆ

بینایی لە چاوم سەردەکا
هاتوومە نسیەی دلّت
عاشقێکی دەردەدارم
بۆگەردن و بۆنی پرچت
لەبێداری بریندارم...

بەیانی باش چاوکالّەکەم
ئەم شەو نیگایی تۆ کوشتمی
خەو،لە دیدگای ڕوونم تۆرا
شەرابی عیشقی تالّت
بۆ کەناری بێ هەستی بردمی

هەستە لەخەوشار بۆنی بارانی گرتووە
سپێدە نەشئە کێشە
ڕوناهی دلّمی گرتووە
لەگەلّ باس و خواستی گزنگ
هەناسەت ڕۆحمی بردووە
پاساریەکان دەستیان گرتووم
لەگەلّ گزنگ، هەرخۆم هاتووم
هاتووینە حەوشەکەتان
بەر پەنجەرەی ژورەکەتان

پەنجەرەکە بترازێنە، دلّم پڕ ئاخ و برینە
هاتووم لە گزنگەوە هاتووم
بەسەدان خەیاڵی سەرکەش و
خەونی بەر بارانەوە هاتووم
هاتووم بلّێم نارۆمەوە
پەنجەرەکەم لێبکەرەوە
بارانی ئەمشەو لێی داوم
مەلی بێلانەی خوساوم
هاتووم شپرزە و ترساوم
گوڵم هەستە بەئەسپایی
پەنجەرە کە بترازێنە
ڕوخساری شێواوم بدوێنە

بە ژێر باڵی هەوورا هاتووم
لەگەڵ فرمێسکی ئاسمانا
گریاوم بەدزی دلّمەوە
زانیم ،لە ناو دلّما نوستووی
ترپەی دلّم بۆ ڕاگرتووی
شیعرەکانم بۆ ڕاخستووی
باران وا گەشتە سینەم
لەناو دلّما هەلّمگرتووی

دەستەکانم ،هەستەکانم
ئیلهامی شیعری گریاوم
چاوەکانم تێنوسەکەم
لەگەڵ نیگایی حەپەساوم
ئاوێتەی سەرمای شەوێ بوون
لەبێدەنگی دا نقوم بوون

هەستە بلێ:-
بەم شەوە چۆنەهاتووی
هەوور دەستی گرتووی هاتووی
باران ڕێ نیشانت بوو
بە باڵی (با)دا هاتووی
پێش سپێدە،چۆنە هاتووی

هەستە بلێ:-
تا بلێم ،کە چۆن هاتووم ؟
پاساریەکان دەستیان گرتم
عیشقت باڵی پێ دەرکردوم
خۆشەویستیت،ڕۆحی بردووم
هاتووم بلێم بەیانیت باش
خاوەنی دڵی وردو خاش

پەنجەرەکە بترازێنە
نیگایی ماتەمم بدوێنە

حەزم وایە هەموو ڕۆژێ
بە شیعرێکم ماچت بکەم
سەر بنێمە سەرسینەت و
لێو بۆ سێوەکانت بەم
پەنجەکانم تێکەڵاوی
زولف و پەرچەمت بکەم
حەزم وایە ئەمڕۆ زیاتر
لەڕۆژەکانی تر، جیاوازتر
لەخەوهەڵنەسی بێمەلات
پێت ببەخشم ڕۆحێکی تر

دەستەکانت توند بگرم و
لێوم بنێم بەلێوتەوە
هەناسەکانت هەڵمژم
تا لەڕۆحتا دەتوێمەوە
ئینجا هەست بکەم لەلاتم
لە باوەشما چاو هەڵبێنی
دڵی ماندووم بدوێنی

بلێی هەستە بەیانیت باش
خاوەن دلێکی ورد و خاش

مالّی دلّم ڤینۆسەکەم
ئەمڕۆ باران،زۆر بە ناز تر
بە ئیحساسەوە دەبارێ
قەول وایە، دلّی من و
خاکی وشك و کانیاوەکان
پاراو بن جار نا جارێ

بەیانیت باش گیانی دلّم
هەور شاری داپۆشیوە
باران بە لێزمە دادەکا و
چەم و جۆبار پێکەنیووە

سەرمایی نەبێ پەپولەکان
باران بۆنی قژت نەکا
ڕۆحم لە تەنیشت دلّتایە
نەرمە باران تەڕی نەکا

هەناسەکەم
بێ دەنگ هەستە تەندروست باش
من هاتووم
کەپێت بلێم بەیانیت باش
بەیانی زوو
بێ گوێ پێدانە بەربەست و
دەرگاو پەرژینی ماڵەکەتان
لە پەنجەرەی شیعرێکمەوە
هاتومەتە نیو ژوورەکەتان
هاتووم بۆ,بۆنی هەناسەت
هاتووم پرچەکانت داهێنم
پێش نەسیمی بەیان هاتووم

هاتووم خەمەکانت بلاوێنم
هاتووم پێخەفەکەت پیابەمەوە
نەبا دڵم سەرمایی ببێ
باڵم دەکەم بەڕاخەر و
شوێن سەرەکەت نەرم تربێ

شەهرەزاد گیان
ئەوەندە ناز بەخشندەی
هێندە نیان،خۆت نیشانی گوڵ داوە
هەموو ڕۆژێ
سپێدەی سبەینانێ
باخچەیەکی شار بۆ ناسینت وەستاوە
لە حزووری هەتاوێکدا
بۆ ڕوخسارت ،پەپولەکان
شاهیدیان بۆ ئەو ڕاستیە داوە

خەندەکانت هێندەجوانن
خەم خەجاڵەتی دەکێشێ
کە، ڕۆژێك تۆی گریاندووە
کاتێك سروشت ئەچێتەوە
تکای چوار وەرزی بگۆڕێ
دەڵێت: هەڵەیەك کراوە

زستانی تەزینی ڕۆح و
نەوبەهار بە گوڵ دراوە
گەرمە سێر، هاوینەکە و
پایز بۆخەزانی درەختەکان دانراوە
وەرزی ڕوخسار جوانی
نیگایی بینایی عەشقی من
لەکوێی ئەم هاوکێشە دانراوە
لەئێستاوە
ئێزن خوازی پایز بکەن
لەدوای خەزان
شەبەنگ شاهیدی بۆ داوە
باخچە بە کۆڵێ بەڵگەوە
پەپولە بەخۆی و عەشقەوە
دادوەری وەرزی جوانی ئەمر فەرموو
نیگای شەهرەزادی منە جوانی بەگوڵەکان داوە

هەناسە ساردی مەستانە
عەریفێکی وەك من نەبێ
ئەحکامی عورفی سوتانم نەبێ
ئاخر بڵێ:
کێ بەرگەی ناسکی تۆئەگرێ

دڵی هەزاران جار لەت کراو
بێنازی تەمەن بە جارێ سوتاو
ئاخر بڵێ؛
عەودالێکی وەك من نەبێ
کێ لە نیگاو نازی جوانی
پێکەنین و ئەوینی تۆ حاڵی دەبێ...
لێوی تینوم بۆ لێوانت
لەم وەرزی ئەوینە
چ کات هەڵاڵەی نیگاکانت
پەپولەی ڕۆح سەرمەست دەبێ...

ئاخر بڵێ، باوەشی گەرمی بێ مروەت
سەرت بە نرکەی دڵ نەبێ...
ئەم عاشورای شیوەن و ڕۆ ڕۆیە
ئاه گیان شەهری دڵم
چلۆن بەچی تیمار دەبێ...؟
دە پێم بڵێ هەناسەکەم
جارێ خەو چاوی گرتووی
لەناو جێگا ڕاکشاوی
پێخەفەکەت سەری گرتووی
ڕۆحم ئەمشەو هاتبووە لات

جەفای جوانیتی کێشاوە
تا ئەوکاتەی بەهۆش هاتم
هەواڵی تۆی بۆم هێناوە

تۆ دەزانی رۆحی شاعیر
لە تەنیشت و
لەبەر پێت و
لە ناو دڵتا بەجێماوە...
لەهەنگاو و
لە لای ڕاست و
لەلای چەپ و

لە پێشەوە و
لەپشتەوەی هەموو ڕۆژێکت وەستاوە
من بەتەنیا ، تۆشك ئەبەم
کە پێی بڵێم شەهری دڵم
دڵ و ڕۆحم بەیانیت باش
منم خاوەنی دڵی وردو خاش

پێدەزانی یەکەم کەس بووی
ڕوناکیتدا بەئاسمانی دەروونی من

شەبەنگ گەشتی پێش پاساری
بەرلەوادەی لەدەسدانی سەرنجی من
بەیانی باش شەهری دڵم
شیعرەکانم بناسەوە،ئیلهامی سپێدەی گرتووە
وشەکانی بخوێنەوە
لە تۆ سەرچاوەی بردووە
هەمووی پڕە، لە ئاخ کێشان
پڕ لە سۆز،خۆشەویستی
پڕن لە بۆنی هەناسەت
پڕن لە نازی دڵ ویستی

جا تۆ بڵێی : بۆژوانێ
بەشیعرێکم ڕازیت نەکەم
جا تۆ بڵێی:- بۆ بینینت
وشە لە ژێر پێت ڕانەخەم
شیعر نەتوانێ ڕازیت کا
وشەکانم نەت دوێنێ...
دووعا دەکەم،ڕەنجە ڕۆبن
خودا لە منیان بسێنێ...

بەیانیت باش هەناسەکەم
شار بۆنی بارانی گرتووە
پاساریەکان بۆ پێشوازیت
پەرژینی گوڵیان تەنیووە
بەئاوازی نوێوە هاتوون
تا نەتبینن نارۆنەوە

هەستە لە خەو هەناسەکەم
من و باران و پاساریەکان
بۆ بینینی تۆیە هاتووین
دنیا مات و بێدەنگە
ئەم شەوهیچمان،نەنوستووین

عیشق وەك موسافیرێکی بێ نیشتیمان
بە رۆحماندا تێپەڕی
شەپۆلی بێدەنگی
مۆمی هیوایی خامۆش کرد
هەناسەیەکی ئەو ڕۆژانەمان بۆ نادرێ
کە ،پڕ بوو لە نیگایی خۆش بەختی

شەهرەزاد گیان شیعرێك هاتوو
لەپەنجەرەی خەیاڵی دام
ئەم بەیانییە جیاواز تر...
لە سەرئەژنۆ کەلێی ڕامام
ووتی هەستە بنوسەوە
هاتووم بلێم:
مەع مەعەی کۆترەکان
گفتوگۆی عاشقانەیە...
ژوانی گوڵەکان
بۆ دیداری خۆر ،خۆشەویستی یە...
گۆرانی (جادەچۆڵ و سێبەر بوو)
سۆزە،جوانی ژنە،وەفاداری یە
شەپەنگ و سپێدە پێکەوە
ئیلهامی جوانی دەبەخشنەوە
خێرا هەستە بم نوسەوە
بەم شێوازە بیهۆنەوە

شەهری دڵم نازانم تاچەندی تر!
چەند ڕۆژ و چەند ساڵی تر
واژوی پەیمانی کاڵفامیم لە ڕۆحتدا قەرارداوە...
کزر نەبوو کلی چاوت
وەك شوێن تاتۆی لێوەکانم وشك نەبوو
پەنجە مۆری بەڵێنەکەم
پەشیمانم...
دادی بێدەنگی دەم کوژێ
قوتابیەکی خراپم
وانەی دابڕانم خوێندوە!

بەبێ خاوسی بەوەرزی تەزیوی ڕۆحتا
لەدنیایی بێدەنگی، خەڵوەتم فێرمەکە
مەمکە بە مسافیرێکی بێ لانە
چونکە مەستانە بێ لانم...
لەتەنیایدا ، لەگەڵ تەنیایی بەشەڕدێم
خۆم ئاشت دەکەمەوە
بەخەیاڵەکانی تۆ بینین...!

# تەمەن



بارینی بەفر لەخەوندا خەمبارییە و

لە سەر و ڕوخسارم باری پێش ئەوەی خەون ببینم ...

وشەیەکم ماوە بۆ وتن ،لێم بڕوانە شەهرەزاد گیان

نیشانەی دووریت لەبەختی ڕەشم دا ،

خراپ ڕوخساری سپی کردمەوە...

ئەمەیە نایەکسانی یە ،لە سروشتا

بێدەنگیت، چ سووتانێکە

تاڵە ڕەشەکان سپی دەکاتەوە ،نەك ڕەش ...!

## حامید ژەنیار

شەهرەزاد ،لە کوێیی بێ ڕەنگی ئەم ڕوخسارەدایت
لە کوێی ژێی بێدەنگی ئەو دنیا ژاوەژاوەدایت
وەرە بە چاوی ماسی لێی بڕوانە
عاشقی ڕووباری، لە عاتیفە دەبیت...
بە نیگایی تریفە لێی بڕوانە
ئیلهامەکانی ،لە پەلکە زێڕینەی پرچت چیێ بووە
بە چاوی ئاسمان لێی بڕوانە
بیابان ئاسا تینوی زریانە
بە گوژمی وشەی عەشق سەرنجە بدە
بۆ پاراوکردنی ڕۆح، یەك دلۆپ شەونمی نیگات
سەدەیەك خەندە چرۆ دەکا
شەهرەزاد ... لە کوێ ی شەرحی ئەم بینینەدایت...؟
تەماشا ...
پێنوسەکەی وەك باخچە و پەنجەکانی گوڵ دەگرێ
سپێدە بۆ بەخێرهاتنت ڕادێنێ
بەهار بەو هەموو نازەوە
پایز بەشین و سۆزەوە
لە شیعرێکیدا تۆ دەنوێنێ

ئەستێرە دەدات لە پرچت
پاساریەکان ڕادەسپێرێ بۆ دیدارت
بەفر دادەگیرسێنێ و گزنگ دەکات بە تکا کار ...
یادەوەریەکانی لە ئەلفی ئەشقەوە تا واوی ونبون
خەونەکانیشی تۆیت...بەس تۆ
دابڕان لە نیگایدا دەچێتە پێناسەوە
تەرجومەی سەرنجەکانی وابەستەیە بەڕۆحتەوە
شەهرەزاد تۆ لەکام مەنفایی ئەم بینینەدایت
نغرۆبوونت بە جوانیدا هەڵواسیوە
سوتانت داوە ،لەیەخەی خۆش بەختی
ونبوی کام سەرابی بێناونیشانی
تارمایی چ دەردێکی بێدەنگیت
ئەرێ تۆ کێیت ...؟

# چی دەبوو، هەتا مردن لەگەڵ تۆ بام



بێدەنگیت لە نرکەی ئەو پیرە دارە دەچێ
کە،بای پایز ئەیشکێنێ
ئەزانم بیرەوەریت سیخناخە
لە پیتەکانی پەشیمانی!
نیگاکانت لە نێرگزی ئەو مێرگانە دەچێ
عەوامێ چاوەڕوانی،بۆ باڵایی بێدەنگی دەدووری
هەڵوەدایی نمەی بارانی خۆزگەیەکن بباری

عیشق وەك موسافیرێکی بێ نیشتیمان
بەوەرزی ڕۆحماندا تێ پەڕی
بێدەنگی مۆمی هیواکانمانی خامۆش کرد
هەناسەیەکی ئەو ڕۆژانەمان بۆ نادرێ
کە،مەست بووین ،لە نیگایی خۆش بەختی...!

دەزانم لە وەرزی خۆش ویستی دا
بێدەنگی سپێدەی نەزیفی دابڕانە؟
لە ئاوابوونی عیشقدا بێدەنگی دەدوێ
تەنها زار گریانە ،ئیتر دڵ دەڕەنجێ
تائەوسەری مەملەکەتی چاوەڕوانی؟
وەك دێوانە بەتارمایی عیشقی شەم؟
ڕۆح بەری نائومێدی دەگرێ...
مەلی عیشقم لەم قاقڕە دارستانە
چلۆن وەرزی بەرزە فڕی هەڵوەرین دەبڕێ...

دەزانم ، من باڵێکم نی یە بۆ فڕین
بەرەو سنورەکانیماڵئاوایی...
تۆش ناگەیتە کەنارەکانی دەرباز بوون
لەعیشقی من؟

شەهرەزاد گوێ ڕاگرە...
عیشق حەزێك نەبوو
گەیشتن بە چێژەكان
تاكۆتایی هەڵهاتن لێی دەربازبم
عیشق فەرمانی نابینایی دڵ نەبوو
لە یاد بچێ و تیای بێزاربم
ئیدی بە ڕۆح عاشقت بووم
وەرزێ نەما بە نێوی دابڕان
چێژێ نی یە بەناوی حەز و ڕاموسان
عیشقێ نی یە بە یادی لە بیرچوون...
كە،گفتم دا ڕۆح بڕیارە عاشقت بێ
خۆشەویستیت بە پێنوسی شاعیرێ ئەنوسرێ
ساتێ نی یە بۆ كاڵبونەوە
كاتێ نی یە بۆ لەبیر چوونەوە...!

لە یەكەم نیگادا
وەرزی پێنجەم ناوی عیشقی بۆ دادەنرێ
وەرزی گوڵ و وەرزی دڵ و وەرزی ژووان...
كاتەكانی ،لەگەڵ من و هەڵهاتنی خەندەیەكت
ڕۆژەكانی هەفتە(هەشت )بوون
كاتژمێری چاوەڕوانی تۆ و

شەوی یەلدایی بێداری من؛
هەڵە بوو گیانە هەڵە
بیست و چوار کاژێر نەبوو؛
یەکەم نیگا لە سەرنجە غوورەکانی سەر مەستی دا
کات دەوەستا لە چرکەکانی چاوی تۆوە
خۆش بەختیم ئەژمار دەکرد...!

بە نەرمە شەپۆلی دەنگت،
لە شەوە زەنگی تەمەنم
ڕۆژی نیگاتِ هەڵدەهات و غەم ماڵئاوایی دەکرد...
لە دنیایی بێدەنگی تۆدا
ڕوودەکەمە محرابی خۆش ویستن
بەفر ئاسا ئەتوێمەوە بۆ تونێتیت...
لە وەرزی ستو بە دابڕان
وەك سێبەری کەپری سەرەڕێ
لەسەر کوچەکانی پڕ مەراقم چاوەڕێتم
دەمەیەك بەگژ تەنیایی خۆمدا دەچم
سەردەمێك...
وەك لاپاڵی پەنگ خواردوو، بە باران ڕۆ دەچم
ئیستا باخچەی دلّم،شەلّاڵە بە دابڕان
ئێستا نە گوڵی دەپشکوێ
نە هاناسە و نە پەپولەی بۆدێ...

لە تەنیایی لەگەڵ تەنیایی بەشەڕ دێم
هەر خۆم ،من ئاشت ئەکاتەوە
بە خەیاڵەکانی تۆ بینین!
گلەی لە ڕوخسارم ئەکەم
وەك ڕوو خۆشترین مرۆڤ
نمایشی شانۆی ئەکەم
ئەگەر هاتیە...
سەر مەزرا سوتاوەکانی دڵم
هەر بۆ ئەوەی خەمبار نەبی نمایشت بۆ دەکەم...

لەگەڵ (با) دا
ڕۆژەکانی بێ تۆی ئەژمار دەکەم
کات و ژوانی بێ تۆی بەر (با)ئەدەم
کە،نەبونە پارچەیەك شەختە و
بەر لە ماڵئاوایی نەتوانەوە
دەزانی بەهاری سیمای وێرانەم
لە ئینجانەی خۆشەویستیت گوڵێکم تیا چێکردووە
بە شەپەنگی خەندەیەکت دەژێتەوە

شکۆفه سپیەکانی دڵـم
بە هەناسە تاساوەکانت دەپشکوێ
خۆزگەم دەخواست...
دوو داری بێ بەری سەرەڕێی
وشکە ساڵی بوینایە...
خۆهیچ نەبێ
لـەم دوو مرۆڤەی ئێستا دڵ خۆشتر دەبووین...
چی دەبوو ،دووگوڵی سور بوینایە
لـە ئینجانەی بەرهەیوانی عاشقێکی چاوەڕواندا!
پێکەوە تینوێتیمان دەشکاو
هەرپێکەوە لاواز دەبوین و
هەرپێکەوە وشك دەبوین
تا وەرزی هەڵوەرین پێکەوە دەبوین

خۆزگەم دەخواست...
دوو تاڵ لـە زوڵفی شۆخێکی بەنازی
لێوتەنك بوینایە...
هەرهیچ نەبێ جار بەجارێ لێك دەئاڵاین و
لـە تەنیشت یەك شانە ئەکراین..
بەیەکەوە، بۆ سەرگۆنایی ڕوخسار وەلا ئەنراین
خۆهەر بەیەکەوە ئەبووین

شەهرەزاد گیان گویٚ ڕاگره
که بیرت لیٚ دەکەمەوه
دەچمه بەردەم ئاویٚنەی ڕۆژگارم
ئەو پرسیاره لەخۆم دەکەم
کە،ناتوانم وەڵامی بدەمەووه
ئەڵیٚم :- چی دەبوو لەلای ئەوبام!
دەڵیٚم :- چی ئەبوو
تەواوی تەمەنم لەگەڵ تۆبام...؟

# نامـەی دووەم



سلاو ... دلّی من ڕۆژەکانی من ئاوایە،بـەیانیان کـە چـاو دەکەمەوە هیواخوازم تۆ بینم ، حەزدەکەم بەیانی باشت لـێ بکـەم ، تا هیوای ڕۆژێکی بەختەوەرت بۆ بخوازم و ڕەنگ و دەنگت بڕژێتە بەیانیمەوە ، ڕۆژەکەم پیرۆز بێت ، جـار جـارە دلّـم قولّپێـك دەدا دەچمەوە سەر ئـەو وشـە و ڕسـتەتانەت،کە وەك کلّـۆ شـەکرن و دەمم شیرین دەکەن..

بـۆ بێـداری خـۆم و هەناسـەیەك بـە دلّـم ،سـەری چـەندین وشـە دەشکێنم،ڕەنگە تا چێشتەنگاوێ لەبەر خۆمەوە بیانلێمەوە،هەنوکـە کات دەچێتە سەر نیوەڕۆ.

ساتێك لەگەلّ وێنەکانت دەدوێم ، نـەفرەت لـە فرمێسـك دەکـەم ،ئەگەر بەر چاوم لێلّ بکەن و بەڕونی تۆ نـەبینم ، کـاتی زەردەپـەڕ

دەست دەخەمە دەستی بیرەوەریەکانت ، پیاسەکی دوو قۆڵی دەکەین ،تا دێرەکانت ئەزبەر دەکەم ، ئیتر شەو کەزیەکانی دەکاتەوە ، وەڵێ نەتریفەی مانگ سوکناییە ، نە ڕۆشنایی لە ئەستێرەکان دەبینم.

هەر خەریکی ئەوەم پاڵ بەکاتەوە دەنێم ، میلی کاتژمێرەکە هەرچەندێك نیشاندا خۆ باکمان پێنیە ، گرنگ ئەوەیە تۆ دەردەکەوی ، ئیتر چاوەڕوانی و ئازارو هیلاکی ، لەیاد دەچن ، من و تۆ و شەو دەبینەوە ڕێبواری هەمان ڕێگا ، تا دوا هەنگاودەڕۆین ، سنورێك ناکەینە بەر بەست ، شەو هەراسان دەکەین ، هەتا بگەینە کۆتایی و شەوشاد بکەین ،

هەموو ڕۆژێ هەر بەونیازە لەخەو هەڵدەستم ،کە تۆ دەبینم، ئیتر بەهانەیەکم دەبێت تا بژیم ،من لە تۆ دەپرسم ژیان چەند (تۆ)ی تێدایە ؟

بەیانیان ،پەنجەرەکە دەکەمەوە هەستەکەم هەوا پڕبووە، لە عەتری هەناسەکان،چاوێك لە گوڵی نێو ئینجانەکە دەکەم چەند هاوشێوەیە لەگەڵ لێوەکانت قاوەیەك ئامادەدەکەم.

وەڵێ لەبیری (تۆ)دا،نازانم هەستی تاڵی چیە..؟

هێشتا نەباتی ڕامووسانێك شیرینی ماوە ، دواجار دەچمە سەر گۆرانیەك،وشەکانی بێ تۆیم بۆ شی دەکەنەوە ، ئاگاداریت ژیانت چەند جوان و ئاوەدان کردووە.

ئاگاداری ئەوەشم ژیان هەر (تۆ)یەکی لێیەو ئیتر دووبارە نابێتەوە.

ئەوانەی ناوم هێنان بە تۆوە ،هەم ڕەنگی ژیانیان جوانکردووە و هەم تام ، دەنا گوڵ لەکوێ ڕێی دەکەوێتە جوانی و هەوا کەی دەچێتەوە سەر عەترو شیرینی نازانێ چێژ چیە ..؟
وای لە(تۆ) وای لەخۆم بەو دڵە بچوکەمەوە توانیم ئەو عەشقە گەورەیەی تۆ هەڵگرم ،شەهرەزاد گیان بێداریت و سەرقاڵیت تاقوڵایی ئێسك دەڕوات، ئەگەر کەمێ وەلایان بنێیت باشترە و خۆت بەشتی بچوکەوە خەریك مەکە شەڕی چارەنوس بە فەرهادی چیایی بێستون نەکرا ،بە شەم و پەروانە بەلیل ومەجنون ،بە مەمی ئالان و زینی بۆتان نەکرا،لێگەڕێ ئەم چەرخی گەردوونە ئەم سیای سوبحی چارەنوسە لەم چەرخی پۆخڵەواتە ،بە تۆ ناسوڕێ لێی گەڕێ با چارەنوس ئیشی خۆی تەواو بکا ،
تۆ هیوات بەمن بەخشی وتت تەنها دڵ خۆشبە تۆ خۆت گوتت بۆ ئەوکاتە بژی دڵت خۆشە ،خۆت گوتت دڵخۆشبە ، دەی خۆت شفای بەهاری دڵی من بوویت ،دڵتەنگی خۆت لە پایی چی ...؟
کەمێ خۆتی لێ وێڵ بکە وانەزانی هەموو جارێ دەڵێی باشم ئیتر وایە هەموو دەڵێین باشین، پێم گوتی گیانم لەتەنیشت ڕۆحتایە بە کەمترین ئاوازی بێداریت هەست دەکا،بیتاقەتی و بیرکردنەوەت،ئەوەنی یە،شەرحی کۆڵانەکانی ژیانت و جەنگی دابڕان بکەی ، شازادەکە خۆتی شاجوانی ئەم دراما پێکەنینانەی ژیان ،کە لەم چەرخە دەمان هاڕێت ،تۆ بەتەنها شازادەی قەڵاکەیت شەڕی گەشتن بەتۆ و ماچی ژیانەوە ،ئەرکی شاسوارەکانە ،

جەنگی ملـملانێ ی چارەنوس ئەرکی تۆ نی یە ،لێگـەڕێ بزانـە چ
سوارێکی قارەمان پەتی ملی هەژدیهاکە دەپسێنێ و پێت دەگـات ،
لە یەکەم ژوانماندا پـێم گـووتی گەیشـتن بـەتۆ ئەستەمە جگـە لـە
پەرژینی دڕکـاوی تـۆ شـازادەی قەڵایـەکی بەرزیت،بەربەسـتەکانی
گەشتنە بە تۆ،تەنها جوان بە، دڵخۆش بە، ڕۆحت ئاسودەبکە..
شەهرەزادەکەی من ،دنیایی جوانی خەیاڵی مـن ،ئیلـهامی هـەوێنی
خامەو بیری هۆشی من ،تکایە دڵخـۆش بـە ،خـۆت ئـەوە دەزانـی
منیش دەزانم هـەموو ئەوانـەی هـەڵوەدایی گەیشـتنیانە بـەتۆ ئـەوە
دەزانن ،کە

تۆ جوانیت دڵ ناسکیت وەشازادەی،ئیشی تۆ هەر ئەوەندەیەو بەس
ئیتر دەبێ شاسوارەکانی عیشق ئەسپی خۆیان تاوبدەن تادەگەن بەتۆ
...تکایە لەبەرخۆشت نەبێ لە بەر دڵی من، لە بەر خـاتری گیـانی
من ،هەموو شتێ وەلا بنێ،بەعیشقەوە بژی دڵخۆش بە..
وانەزانی ئەم وشانە دەربڕینێکی نوسین و ئاسانە ئەم وشانە ئـەنجامی
بێداری تۆیە بێتاقەتی و خەمباری تۆیە کەدڵ و گیانم پەی پێ ئـەبات
،خۆشەویستم شەهری دڵم.

# هەتاو



چەخار ئەو زەك ولقە سەوزانەی شیعرم چییە
لەشەبەنگ ڕانامێنن نوێژی ستایش دەکەن
بۆ هەتاو نا...!
بۆدییدەنی تۆی دەکەن

سەر مەستم...!
ڕەنگ زەردیم بەخەیاڵەکانمەوە
وای لە عەرشی دابڕان و بێدەنگیم
خەیاڵەکانی توشی نەزیف کردوم
بیَ ئومێدی ژیانم لێدەچۆڕێ
بە خەمزەی چاوەکانی

ڕەگی عیشقی ڕواند
بەویسالّی وەهم حەزی دەبەخشی
ئەویش تۆ بوویت ،شەهرەزاد

هەموو ڕۆژیّ پێی دەگوتم بەیانی باش ..مردن!
هەموو ساتیّ
لەپێش دەرگاو
لەسەر خوان و
لە ناو نوێن و
لە ڕوخسار و
لە مەلۆتکەی شیعرەکانما بیّ ئومێدی!
لە عەشق و
لە خەیالّ و
لە بیّ ڕەنگی دەستەکانم
لە وەس وەسەی هەستەکانم
لە قەتیسی فرمێسکەکانم
لە هەناسە ساردەکانم
جەلادێك...لەچەشنی
مردن بیّ ئومێدی و عەمباریّ خەم...
لە قاپی هەموو بەیانیەکدا وەستابوو...

لە خاکی دڵ و
لە ئاسمانی ڕۆح و لە ئیلهامەکانمدا
وەشاندی هیواو تۆوی خۆشەویستی
خۆشبەختی بوژاندەوە
هەستی تۆ ناخی تۆ...
نیگاو خەندەو ویقاری تۆ دڵم ویستی

خۆش بەختی و وەرزی خەندەی دڵ
تامی ژیان و دنیای جوان بینی من
هەموو شەوێ ڕۆحم دادەنیشێ بەرامبەرم
لە خەومدا خەودەبینم..
لە تەنیشتم ڕاکشاوی
گۆرانی بۆ ڕۆحم دەڵێی
جار جار خەندەو ، ووردە ماچ و
سەما بۆ وشەکانم دەکەی
وای لە قینی شەوانی ڕابردوو
ئای لە خۆشەویستی شەوانی ئیستا
ئەویش هەر تۆی ...شەبەنگی وون بوو، لە بەختم!
لێم بڕوانە چۆن ئەسوتێم
چەند جار بووم ،بەقوربانت...

کڕنوش دێنم خەمی دڵم
پێدەزانی بۆ برژانگی چاوەکانت
ئێستا نیگات،دنیایەکە لەگەڵ خوێنم تێکەڵاوە
ناوەکەشت بەرپرسێکە شێتانە ڕێگام پێداوە...
پێ دەزانی چۆن دەناڵم شیعری ئەم شەو هەربۆ تۆیە
تەماشاکە پێنوسەکەم شوێن پێ کانی ناوی تۆیە...

وەلێ شەهری دڵم
گوڵ بەرامەی خۆی نیشانی شادی نادا
پەپولە دڵشکاوەکانی باخی ئەوین
ئارام ناگرن و
بە دەڤەری بێ تۆیدا گوزەر ناکەن...
هەتا کانی چپە و ناز بە شەماڵێکدا
بۆ سروەی کارمامزێك بنێرێ
هەرچی درەختە خەمبارەکانی
ڕێگای مەنفا هەیە بەر دەگرنەوە

تا دەنگی تۆ
ڕۆحی بیرونم پاراو بکات
ئینجانەی دڵ ،گوڵ شکۆفە دەکات
هەر کاتێك بێیت،

بۆ ئارامی ڕۆحی تەنیام
ڕێگای هاتنت
هەنگاو هەنگاو گوڵی سپی تێدا دەڕوێ...
زۆرن وشەی شکۆفەی وەرزی ناخم
لە چاوەڕوانی ڕۆحی پەپولەدا
لە دەلاقەی بینینمەوە
بەتامەزۆرییەوە سەر دەردەکەن...

دەمەوێت ئەو بارانە بی
خاکی حەزم پاراو بکەی
ڕوانینم شپرزە!
تیشکی ڕۆژێکی نوێ بیت
لە دەم کەلی ئازارەکانمەوە هەڵبێیت
لە ڕۆژئاوای خەمەکانمەوە
فلوتی ڕۆژهەڵاتنەوە بژەنی

بە تروسکەی ڕوناهت لە شەوەزەنگی دڵمدا
تۆوی ژیان لە چاوەکانمدا بچێنی
ئارامی بە ڕۆحم ببەخشە
لە یەکەم ژوانی ژێر درەختی ڕامووسان
شەڵاڵم دەکەیت ، بە نیگا سیحراوییەکانت

خەیاڵ لە مەلۆتکەی هەناسەت هەڵمدەگرێ و
رۆحم ئاوێزانی جیهانی هێمنی دەکات
ئەفسوس دڵتەنگی زمانی نی یە
دەنا دڵ هەرگیز عاشق نەدەبوو!
بە تاسەوە سەرنج بدە
پرژانی فرمێسکی خۆشەویستی
لەو کاتەی هەناسەکان لێك دەئاڵێن
پیتەکانی عاشقبون
وشەکانی ئەویندارى لە شەقەی باڵ دەدەن

ئەوەی بارگاوی دەبێ
بە ئارامی لە کەناری بێ ئۆقرەییدا
سازشت دەکات، دووری پێوەری نامێنێ
رۆح بە زەردەخەنەت ئارامی دەگرێ

ئارامە بە میلۆدی دەنگت
ئارامە بە وشە ئاگراوییەکانت
زۆرجار هەوڵی تێپەڕینم داوە
زۆر کات بازی هەڵفڕینم داوە
زۆر سات پرسەم بۆ تەرمی عیشق داناوە
لە دارستانی خەیاڵە ئەفسوناویەکانت دەرنەچووم
تێپەڕ نەبووم و هەڵنەفڕیم

شینی دابڕانم گێڕاوە
نێچیرێکی مەلولم بە تیری بزەیەکت دەپێکرێم
ڕمی نیگات سەرنجی کردوم بە دوو بەشەوە
بەشێکم بەرەو تۆ، وەك روانینەکانت
ئاوەژووی دنیای بێدەنگی بووە

بەشەکەی ترم بریندار بە شمشێری فیراق
رۆحم ئاوێتەی دنیای خامۆشی دەبێت
هەر کات مەملەکەتی بێدەنگیم دەژاکێنی
وەرزی پشکوتنی گوڵ ئەدەی لە هەستی بینینم
بەچرپەیەك ئارامی ئاوێزانی رۆحم دەکەی
ئەمە عیشقە سنورێکی نییە بۆ ڕاموسان
دەنگت ئارامی ڕۆحە وەك تینوێتی بیابانە بۆ باران...

## بۆنی باران





خۆشەویستیت گەورەی کردووم
لەوە زیاتر خۆشم دەوێی
کە ،لە هەموو دنیاهەیە
هەست بە ترپەی دڵت دەکەم
چونکە، لەوێ بوونم هەیە

شەهرەزاد ئازار دەچێژم
کە بیرت لێ دەکەمەوە
چاوم پڕ دەبێ لە ئەشك

بەچی ڕۆحم ژیر کەمەوە
باڵندەکان هەڵدەلەرزن
ئاسمان چرکەی لێ بڕیووە
شەختە بەفری قەراخی شار
تەواوی ڕێگای بڕیووە
ڕۆحی ماندووم
بۆ بینینی تۆ تەزیووە

هاتووم بەدڵێکی شکاو
هاتووم بەچاوێکی گریاو
خۆشەویستم وادەی دوری
نیگاکانی بیر بردمەوە
لەچاوەڕوانی ئەم عیشقە
حەسرەت ناخی سڕیمەوە

ئێوارانێ...
هەستی نوسینم نامێنێ
کە بیر لەتۆدەکەمەوە
خۆزگە ئەبویت بە وشەی جوان
تابچیتە ناو دڵمەوە
ئینجا، لەگەڵ ئیلهامێکدا

خەندەکانت بنوسمەوە
کە پێت بڵێم خۆشم دەوێی
عیشقت هاتۆتە خوێنمەوە
تۆ دیارنیت و چی وەڵامی دڵبەمەوە

دەزانم، تۆ لێرەیت!
بەهاتنت نیگاکانم
گوڵ دەپۆشێ چرۆ دەکا...
ڕۆحم گوتی هاتۆتەوە
باکم نی یە با هەر بڵێن
ئەو شاعیرە، درۆ دەکا...
ئەها باران
بۆ پێشوازیت، چۆن دەبارێ
ئەها باخچە و گوڵەکانی
سەما دەکا هەموو دارێ
هەوور دەزانێ تۆ لێرەیت
جوانیان بە شار بەخشیوە
هەورە تریشقەی ئاسمانێ
بە ناڵەی دڵمی زانیوە
پێبکەنە شەهرەزاد گیان
شار سەرسامە بەهاتنت

ڕۆحی منیش ئاسودەیە
بە بینین و بۆن کردنت...
هەتا ئێستاش ڕێبوارانی شەقامەکان
باخچەوگوڵ و کانیاوەکان
دەزانن تۆ لەناودڵمای
هەتائێستاش نشێو و سێبەرو ماچەکان
پێکەنین و خەمەکان
پێدەزانن لە هەناسە و ڕۆحی مندای
هەتائێستاش شیعرەکان و هەنگاوەکان
تابلۆکانی خۆر نشین
وادەی ژوان و یەك بینین
ئاشنان ،کە تۆ لە ناو دڵمای
تۆ لە هەناسە و ڕۆحی مندای

ڕوخساری ماندوم
پڕ پڕ بووە ، لەبێ تۆی
ژیانم لێوان لێوە لە مەراق
غەم بێ بەزەی ئەم دوێنێ
ژیانت لێکردووم بە فیراق

نەهاتی شەهری دڵـم
چاو مەست بیێ لـە دیدارت
لـێوم پاراو بێ لـە لـێوت
دڵ ئارام بێ لـە ڕۆحت
پەنجەکانم شانەی بکا
زوڵفی درێژی ئاڵاوت

تا بگەمە چێژی نیگا
نەهاتی و واخەریکە
تەمەنی لاوێم ئەڕوات...
واخەریکە ئەم ئازارە ڕاپێچمکا
بۆ دورترین وادەی وولـات...

واخەریکە...
پەنچەکانم لـەپێش چاوم،هەڵدەوەرێن...
گەڵای وەرزی بەهاری ڕووم
بەرەو پایز واملـ دەنێن...
واخەریکە
دڵ لـەبێ تۆی ڕابهێنم
بە درۆوە هەستەکانم بدوێنم

تۆ نەهاتی و واخەریکە
جەنگی بیٚ تۆی ڕیٚك دەخەم
بەیەکجاری دلٚ دەربکەم لـە دەردو خەم
هەر نەهاتی
گولٚی بەهاری تەمەنم
ئەوەی تائیستا خۆشی ئەویٚ ی ئەوە منم

خۆشەویستم شەهری دلٚم
عشق چی یە ...؟
پەپولـە نەگات بە گولٚ
سەراب چی یە ...؟
چرۆی خەیالٚەکانم دەکەن

گریان چی یە...؟
مکیاژی ڕوخسارم دەکەن
خۆشەویستم شەهرەزاد گیان
هیٚندەی پەپولـە تامەزرۆ و
سەرابی خەونەکانم
هیٚندەی ئەشکی چاوەکان و
نیگای ڕەشی خەمەکانم
لـە وەش زیاتر خۆشم دەویٚیی
هیٚندەی وشە و شیعرەکانم

پەنجەكام خۆشیان دەوێ ی...
هیندەی ڕۆح و هەناسەی تاساوی دووری
لێوەكانم خۆشیان دەوێ...
هێندەی كلّپەی ناخی زەوی
خۆشم دەوێ ی
لە خەزانی هەلّوەرینا بۆ شكۆفە
وەكو بەهار خۆشم دەوێ ی

خۆشم دەوێ
وەك گولّ و خۆرەتاو
وەكو تینوێتی بۆ ئاو
خۆشم دەوێ
وەك شنەبای بیابان
وەك پێكەنینی دوای گریان

خۆشم دەوێ
گەرچی دووری چاوەكانت
دووری خەندەی لێوەكانت
ساتێ نی یە لەلام نەبی
شەوێ نی یە خەمێ نەمخوات
ئەشكێ نی یە ،نەتكابێ بۆ بالّات

دوريت هێندە كوشندەيە
هەست بە ترپەی دلّم ناكەم!
غەريبی هەناسەت دەكەم
وائەزانم ئاهو خەمم بەتۆ دەگەن
لەگەڵ ڕۆحما باست دەكەن

وێنەيەك شك ئەبەم
لەژورێكی تاريك و تەنگ
هەموو شەوێ بەخەيالّی نيگاكانت
ساتێ گفتوگۆم بۆ دەكەن

لە نێو دووتوێی ی پەنجەكانما
تۆ بۆ من و منيش بۆ تۆ
بەنهێنی نيگا دەكەن
لێوت ئيلهامی لە گولّی دزيووە
چاو ئەستێرەيە،بەبێ جريووە
ڕوخساری عەينی مانگی دڵ
پرچی درێژ
ڕەش ...ڕەشتر لەشەوی تەنيايم
خەندەكانی ئەهريمەن
وەك فريشتەی نێو خەراباتی دلّنيام

خۆشەویستم شەهرەزادگیان
با تەنیای دوامەنزڵی سەفەربێ
وەرە و دوری کۆتایی بێ
خونچەی ڕۆحم لەناودڵتا بپشکوێ
دەسا وەرە شەهرەزاد گیان
ئەم دوریە ئیتر بەس بێ...
شەهری دڵم هەرنەهاتی
وادەی تەنیایمان بەس بێ...

## پرسیارە بێ وەڵامەکان



دوا قەصیدەی خەمباری من
ژیلەمۆی ڕووناکی شەوگاری من
...بەیانی باش
جریوەی ئاسمانی شیعری من
نمە بارانی خاکی وشکی دڵی من
بەیانی باش...
گوڵ نەپشکتووی باخچەی هەستی من
کازیوەی مەنفایی خەیاڵی ڕاموسانی من

بەیانی باش...
سپێدەی تیانوسی شیعری مەکر بازی من
عیشقی بەر بارانی لێزەمی بێدەنگی من
بەیانی باش...
شەهرەزادی دولبەری پەروانە ئاسایی من
کەشتی غەرقی دەریایی دڵی بیماری من
بەیانی باش...
شەپۆلی هەڵچوی بێ کەناری دڵی من
یەکەم عەشقی لەبیر نەکراوی ڕۆحی من
...بەیانی باش
پێدەزانی یەکەم کەس بووی
بەر لەنزا
واژوت کرد لە دامێنی وەسیەتی من
تۆ لە گفتی ناخم دەگەی ؟
شیفایی هەستی زامداری من
تۆ لەزاری شاعیر دەگەی ؟
کاتێ ئەدوێ،وەشکلێ من
یەکەم کەس بووی
نەوازشتی دڵم دەرکەی
تۆ ئەستێرەو مانگی ڕووتی شەوگاریی من
نزای ڕۆحی وەلا نراو

داخستانی هەناسەی من
یەکەم کەس بووی
لانکەی شیعرم بلاوێنی
ئیلهام بەخشی پێش چاوی من
لەشکرکێشی ئیمپراتۆری وشەسازی نێو هەستی من
ئەی بۆ ئێستا..
بیری تەنیایی من ناکەی ...؟
ئێواران ئەڕوانیتە ئاسمان ...؟
بێداری دلتەنگی نەکردووی...؟
بۆ جارێ چاوت پڕ بووە لە گریان...؟
ئاسمان لای مالّی ئێوە شینە...؟
ئەستێرەکان ئەچریوێنن...؟
وەك ئەوەی بینایم ئەدوێنن
وەکی من لە مانگت ڕوانیوە...؟
چلۆن من روخسارت ئەبینم
شێوەی شێوای منت تیا بینیوە...؟
نەرمە خەیالێ لێی داوی...؟
بۆ دیدارێکم گەڕاوی...؟
بە بیرتاهات لێم بپرسی بۆ ئەگەڕێم ...؟
شەو لە دیدگایی تەنیایم دا
ڕۆژ وەك و خۆر بۆت ئەسوتێم ...!

# بێزاری



نازانم تا چەندی تر !!!
واژوی کاڵفامیم لە ڕۆحمدا قەرار داوە
کزر نەبوو کلی چاوت
وەك شوێن تاتۆی لێوەکانم وشك نەبوو
پەنجەمۆری پەیمانەکەم پەشیمانم...
لە (وانەی) دابڕان قوتابیەکی خراپم

بەبێ خاوسی بەوەرزی تەزیوی ڕۆحتا
لە باخچەی بێدەنگی وابەستەی بێدەنگیم مەکە
نامە موسافیرێکی بێ لانە
چونکە، مەستانە بێلانم...!

گەڕیدەی بێدەگی تۆم نی یە
شیکاری ئازارەکانت هەڵنادەمەوە
دەستم لە سەر تێنوسی ڕۆحت ڕەنگی خامیان پۆشیووە
دەستم هەزاران جار سوێندی شکاندووە
پەنجەکانم تەمێ کردووە
وانەی لەبیر چونەوەم بە دڵی بەو بەختم خوێندوە
لە ڕشتنی فرمێسکەکانمدا
ناوەکەتم نەفی کردووە
پێنوسەکەم ڕاهێناوە
گەیشتە ناوت مانبگرێ و نەنوسێ

بەڵام چی بکەم...!
لە نێو هەموو تێڕوانینێکمدا
تۆ هەیت، هەووری بارانی ڕۆحم...!
پیتەکانی ناوتم گۆڕی
شکڵی ئاوێتەی ڕۆح بووە
لە ناخمدا چێ کردووە ناسڕێتەوە
چەندین جار بۆبیر چوونەوەت

خۆم لە بیر کردووە
لە بری شوناس و ناوت
دەرۆزەی وشەم لە زاراوەکانی تر کردوە
ئیلاهی مەجنون بمژێنە
چلۆن ڕۆحم ئازاد بکەم،لە بێدەنگی چاوەکانی
چۆن غافڵ بم لە تیلەی چاوی
لە کام پەنجەرەی شکاوی خەیاڵەکانیەوە هەڵبێم
ئیلاهی شیفایەك...!
ئەوە من نیم، لەودیوو خەیاڵەکانتەوە
شپرزەبم بۆ فڕین
وەك سەرابێك بە خەونەکانتا سەفەر بکەم
بۆ چێژی ئەوین ...ئەوە منیم
(با)یەکی سەرەڕۆ ڕاپێچم بکا
پرم بکا، لە خەزانی یادەوەری...
ئاوێزانت بکەم بەوەرزی دەر بەدەری
هەستم بەتەنیایت کردوە
دنیایی بێدەنگی ڕۆحی تەنیاتم خوێندوە

شیکاری بێدەنگیم کرد
ئازارەکانی دەوری بێدەنگی هاوڕێمن
بەلاّم، ئەوەی لە تەنیشت دلّتایە

لە ڕووی ئاوێنە و ناوپۆشاك و هەناسەتایە
لە سەر سەرین، لە نێو شەوگاری تەنیاتایە
ئەوەمنم ڕۆحی عاشقێکە لەگەڵتایە
بۆنی دڵتەنگیت دەکا
بە ئەسپایی پرچی خاوت شانەدەکا
ئەوە منم ..ئا ئەوەمنم

لە بێدەنگی وەرزەکاندا
گەڵاکان حەزیان بەخەزانە
دارەکان بەکۆرس سەمفۆنیایی ڕۆح دەژەنن
کاتیٚ(با) ژەنیاری ئۆکێستڕابێت
ئەشیٚ ئەم هاوکێشە بێسەر وایە
هەڵەی ڕۆحی هەمووومان بێت
تەماشاکە...!
گەڵاکان چەند عاشقی خاك و کانی و
شنەی وەشتی ئێوارانن
چلۆن نمایش بۆ سروشت دەکەن
کۆ ئەبن و ژوان بۆ یەکتر ڕێکدەخەن

گویێ ڕادێرن دەنگی قاقا و
تەقەی پێ و چرپەی پەلکی دار
بەسپۆنسەری(با)یە خەمبار
بە هەناسەی عاشقەکان
چەپلەی هەڵوەرین لێئەدەن
لەم نسرمی بێدەنگی یە
دایکە ،لەکوێی بێدەنگی ڕۆحی مندایی
ناخم ئازاری لێدەچۆڕێ...!
کۆرپەکەت وا خەریکە عاشق دەبێ
دایکە ..لەکوێی...؟

دایکە ..لەکوێی..؟ ڕۆحم واخەریکە دەفڕێ
کوڕەکەت عاشق دەبێ
بەبارانێ نەرم نەرم
ئیلهامێ بوو بۆ ئەو دڵەی کە،دەمگوت مرد...!
تەڕئاوێتە بەڕۆحم
خەمەکانی لێ چۆڕاندم
ئاهەکانی لێ بەش کردم
لەگەڵ ، نمەی بارانێکدا
ڕووی کردینە شەقامەکانی شار

جۆبارێکیان هەڵبەست و
بەرەومەنفا بەرێی کردن
بۆ مەودایەکی نادیار...!
دایکە لەکوێی ...؟
هێندەی دوا وێسگەی ماڵئاوایی
ڕازم هەیە بۆ ووتن دایە لەکوێی...؟
لە دەرونیا خۆرم بینی
لە گەردنیا هەناسەم و
لە باڵایدا ژیانم و
لە چاویدا مانگی گەش و
لە نیگایدا ئاسمانێکی ڕوونم بینی
نەوبەهارێ گوڵم بینی ،کە ڕوخساری داپۆشیووە
بینیم ئاسمان سیاساڵە
ڕەنگی لە چاوی دزیووە

بینیم کانی ڕێگا دەبڕێ بەتافەوە
بزەی لە لێوی دزیوە
ئەوەی نەم دی!!!
دڵی خۆم و هەستی خۆم بوو
لە دەرونما نەرم سوا
لەڕۆحیدا، لە دنیایی بێدەنگی ئەوینیدا دڵم جێما...

## دنیای بێدەنگی



خەڵوەتی گیانی تەنیام وەرزێکە لە بێدەنگی
دونیا یەکە ...!
تا سەر ئێسك ، بونەوەرێکی حەپەساوە
لە جەنگەڵستانی بێدەنگی...!
بێدەنگی لای ئەو چەکەرەی کردوە
بە منداڵی تەنیایی گۆشی کردوە و
لە تەمەنی لاوێتی دا، پێ ی گرتوە

وەرزی گوڵ ، لە دامێنی دا
خەیاڵدانی ململانێی جەهالەت بە ناخیدا ڕۆچوە
ژیانی لێوان لێو بوو، لەو ڕۆحانەی
بەناڵەی تەنیایی هەڵپڕوسکاون و
پڕ بووە، لەوخەمانەی

بە ئاوی عیشقێکی ترازاو لە (بوون) ئاوێتەی نەبوون بووە
لە ئۆقیانوسی بێدەنگی کچێکدا ئۆقرەیان گرت ...!
ئەو لە ڕەونەقی لاوێتیدا
خەیاڵەکانی باڵق نەبوون
لەڕۆحیدا هەموو کوژرا...!
بنوارە گیان پێش بینایی پەی بەئازاری دڵ دەبا
لە ئیلهامی شاعیرێکدا،زاوزێ دەکات و
بەر لەپێڵوی چاو و نیگا
سەرگەردانی نیشانی پێنوسەکەم دەدا
تەماشا ڕۆح لە فەزایی بێدەنگی دا
دەبێتە وشە و
لە ناو دوو توێی شیعردا، هەنسك دەدا

هەر ئەو دنیای بێدەنگی یە و
خوی بەبێدەنگییەوە گرتووە
دیمەنی ئەو ئێوارەی لە بیر ناچێ
خەونەکانی تیا سەر بڕان ، حەزەکانی سوتێنران
چما خۆر ئاوابوونی خۆش دەوێ...!

لەم مەملەکەتی فەنابونە
باخچەیەکی بێ ڕەنگ پێدەزانم
پەپولەی تیا نافڕێ
بولبول تیا نا چڕێ ...!
گوڵەکان خۆیان ڕووت دەکەنەوە ، بە بێدەنگی

گەڵای دارەکان هەڵدەوەرێن بە بێدەنگی
بێدەنگی ئاوێزانی مێژوویان چوو
هەراسانی بێحورمەتین بەحەزی چڵکنی
داوێنی ئەو پیاوانەی بە دەست نوێژەوە
چوونە فەتوایی هەڵپاچینی درەختەکان
ڕابوردین لە ڕاموسانی بەد بەختی
چارەنوس ئەنگوستێکی پێوە نەمابوو
بۆ بێقەراری ڕۆحمان
دەنا چارەنوس، باشترین بەرگدرووی ژیان دەبوو...

لەم خەرابستانە تێپەڕین
بوین، بە جوانترین دۆڕاو
دۆڕاو لە ڕابووردوو، دۆڕاو لە داهاتوو
دۆڕاو لە چێژی وەرزەکان
دۆڕاو لەعیشق و دۆڕاو لەنیشتیمان
دۆڕاوەکان جمك لە بێدەنگی نقوم بوو
لەدنیا جوانەکەی بێدەنگی
وەك نمایشی خەندەیەکی دروستکراو
بە ڕوخساری ڕۆبۆتەکانی مەملەکەتی نەفامی یەوە
ئایی لە خۆتان و لەنیشتیمانی بێدەنگم  ئایی لەخۆمان...!

بێداری ئەوەیە قاقایەك بیت
لە ڕۆحیکی غەمگیندا
تەنها لە خاتری کلتور، خۆت بنوێنی
بێ دەر بەستی  خەونەکانم پشو درێژ
درێژ زۆر درێژ
هێندەی بێدەنگی فرمێسکی ڕژاوی ژنێکی تەنیا

توانیم بگەمە ڕۆح
لە یاداشتی پەپولەیەکەوە
دەفتەری یادەوەریەکانی جوانی بێدەنگی هەڵدەمەوە

پێنوسەکەم هەڵچەقاندە چمکی کوچەکانی بێدەنگی
بە دیواری بیداری ژیاندا نەخشم کرد
بۆ ئەو مرۆڤانەی لە بێدەنگی ژن تێناگەن...!

دەستم سور نەبوو
بەنەزیفی هیواکانی نیشتیمانی دڵت و
لە نگەری کەناری ئارامیدا کەشتی بەختم...!
لەشەپۆلی ڕقدا،
بێمروەتە ئەمەش بوێری نی یە ئەی ڕۆح...!
هەرەمی بێدەنگی بدەی بەدەم (با)وە
چ دەگۆڕێ دەزانم
دۆڕاوترین بونەوەرم لە عەشقدا...!

بەیانیەك شیكاری بێدەنگی ئەو پەیمانەم دەكرد
ڕازی شاعیرێك بوو
دەیجور تێنوسی ئەگریجەی بوو
دیوانە كەی لەدڵیدا كچێنی حەشار دابوو
بێدەنگی چاو بوو...!

فرمێسك شیعری دەنوسی لەسەر ڕیتمی
قولپی گریان و قاقایەكی دروستكراو
لەسەر ڕوخساری كچە شاعیرەكان

لە ڕۆحیدا دنیایەكی غەمگین
لە باخچەی گەردنیدا
پەپولەی كریستاڵ
فڕیوو لە ڕەنگی چاوی
چەمكی كاتژمێری كامەرانی
شەشی سەرماوەرز بوو، بەكاتی هەڵفڕین
پەنجەكانی گەرم بەنسێی دڵ
لێوەكانی ئاڵ و ئەستەمە كردگار بیكا وێنەی جارێكی تر...!
بەژن  چەشنی شنەی وەشتی ئێوارانێ
ئاه.. لە و (با)یی وەشتی سبەینانە
بەتەنیشت ژنێكەوە

نیگایی پڕ، لە خەمزە
لە ڕەنگی پرتەقاڵی گەردنیدا
قەتماغەی بەستووە بێدەنگی...!
چەندین جار ئاگری بێزاری گرتووە
دەیان جار بانگێشتی بۆ مردن ناردووە
خۆی بە تەنافی بێدەنگی گۆڕستانەوە نوساندوە
لە ئازاری لمۆزی دڕکەزی نێرینەکان
گەردی گوڵی ڕوخساری پاراستووە
ژنێك لە چەشنی گوڵی سپی....

# نامەی سێیەم



سـلاو گیانەکـەم سـەختترین کاتـەکانی بـێ تـۆییم تـێ پەڕاندووە، هەمیشە خۆم بەڕۆژەکانی بـێ تـۆیی ڕادێـنم کاتـەکانی تەنیایم دانا بۆ خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی بـاس لـە خۆشەویسـتی و دابڕان دەکات، باس لە بێ وەفـای و جـودایی دەکات،بـاس لـەو چیرۆکانە دەکات ،کە بە سۆزی ئەویندای شکۆفەی دەکرد ، وەك دارێکی بەر ڕەشەبا بەر لە خەزان گەلاکانی دەکردە باران بـۆ وەرزی دابڕان، گەرچی ئاوێتـەبوی بـەگیانم ئەگـەر بلـێم لـە بـیرم کردوی ڕەنگە درۆ ،لەگەڵ خـۆم بکـەم ،گـەر وەك بوکەڵەیـەکی دەستی منداڵێکی مەکر باز کـە ڕۆژی سـێ جـاران دەی گـۆڕێ و

بانگێشتی چێشتە قولانی دەکا، خۆم نیشان بدەم تۆم نەناسییێ و هیچ رۆژێ بیرم لیێ نەکردبێتیەوە، لەگەڵ ویژدانم درۆ دەکەم ، بەڵام لەبیرکردنت و دەرچوونت لە دڵم وەکو لە بار بردنی ئەو کۆرپەلەیە ، کە دایکێک خاوەنی شەش منداڵ بێت و لە پڕ دروست دەبێت ئینجا لەبێزاریدا سەدان رێگا دەگرێتەبەر بۆ لەبار بردنی و هەر دەژێ ، چونکە خودا بڕیاری دابێت بژی دەبێت بژی ،تۆش لەم دڵەم دەرناچی و چەندین رێگام گرتەبەر بۆ لە بیرکردنت نەمتوانی لەکۆڵانە پێچاو پێچەکانی دڵم و لە گۆشەی خەیاڵەکانم وەدەرت بنێم

هەرچیم کرد بۆنی پرچ و دەستە ناسك و ڕوخساری تەلیسماویت لەبیری خۆم ببەمەوە نەمتوانی بێزار نیم و نەمتوانی خۆم لەخەمی دوری و بێدەنگی ڕابێنم دوور و نزیك یەك هاوڕێم هەبوو ئەویش پاش ئەوەی لە خۆشەویستەکەی جودا بوویەوە لەدەستم دا بڕیاری سەفەری داو چوو بۆ هەندەران ئەمەوێ ئەوەت بۆ باس بکەم

هاوڕێکەم مانگی یەکجار بانگێشتی دەکردم بۆ قاوە خواردنەوە، هەمیشە خوی بەیەك شوێنەوە گرتبوو ،ئەویش کافتریایەکی نزیك شەقامی سالم بوو، دادەنیشتین و دەردەدڵی بۆ دەکردم، لەگەڵ خواردنی قاوەیەکی تاڵ دا ڕۆژە شیرینەکانی ژیانی خۆی و خۆشەویستەکەی بۆ دەگێڕامەوە.

زۆر جار بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە ئاماژەی دەکرد بۆ مێزەکانی تەنیشتمان دەیگووت :- جارێك لەوشوێنە دانیشتبووین چەپکێ گوڵم پێشکەش کرد جارێك لەو شوێنەی تردا دەستیم گرت و جارێ هەر لەم شوێنەدا پەیمانمان نوێ دەکردەوە،

گێڕانەوەو باسکردنی ئەورۆژانەی بوونە یادگاری لەژیاندا هەروا ئاسان نەبوو ،ئەم هاوڕێیەم بەر لەوەی دابران لە ژیاندا چەکەرەبکات جگەرەکێش نەبوو،هەرگیز بەبێزاری و خەمبار نەدەبینرا بۆجارێکیش فرمێسکی نائومێدیم بەچاوەکانیەوە نەدیبوو ،تارۆژێك بڕیاری سەفەریدا و من و هەموو یادگایەکانی تەمەن و کۆڵانەکانی منداڵی بۆ ئەبەد وەلاناو بەوشێوە ژیانێکی نوێ ی دەستپێکرد.

من لەگەڵ یادەوەریەکانتا دەژیم و وێڕایی بارگرانی و خەمی دووری بەعیشقی ئەو ڕۆژانەوە دەژیم، کە دڵمان خۆش بووهەرگیز بیرلەسەفەرێ ناکەمەوە دووربم لە هەست و بۆنی هەناسەی تۆ،نیشتمانێ تۆی تێدا بژیت بەعەشقەوە تێیدا دەژیم دڵتەنگیم ئەوکاتانە دەست پێدەکات ،بەوشەقامانەدا گوزەر دەکەم لەگەڵ تۆدا بۆ چەند ساتێ پیایدا تێپەڕ دەبووین ،بۆ ئەم وەرزەو نشێویەکانی نێوانمان جگە لە بەرامەی ڕۆح و سەدەیەك ئاخ لە دوریت ،گوڵ ڕەونەقی خۆی نیشانی شادی نادا،پەپولە دڵشکاوەکانی باخی ئەوینم ،ئارام ناگرن دڵنیابە بە دەڤەری بێ

تۆیدا گوزەر ناکەن، هەتا کانی چپە و ناز بە شەماڵێکدا،بۆ سروەی کارمامزێك بنێرێ،
هەرچـــی درەختـــە خـــەمبارەکانی ڕێگـــای مـــەنفا هەیـــە بـــەر دەگرنەوە،ئەوکات دەنگـی تـۆش ڕۆحـی بێـروونم پـاراو دەکـات ،ئینجانەی دڵم گوڵ شکۆفە دەکات ،هەرکاتێك بێیت،
بۆ ئارامی ڕۆحی تەنیام ڕێگای هاتنت  هەنگاو هەنگاو گوڵی سپی تێدا دەڕوێ ، زۆرن وشەی شکۆفەی وەرزی ناخم لـە چـاوەڕوانی ڕۆحی پەپولـەدان و لـە دەلاقەی بینینمەوە.
بەتامەزۆرییەوە سەر دەردەکەن ، دەمەوێت ئەو بارانە بیت، خـاکی وشکی دڵم پاراو بکەیت ڕوانینم شـپرزە، تیشـکی رۆژێکـی نـوێ بیـــت لـــە دەم کـــەلی ئازارەکانمـــەوە هـــەڵبێیت ،لـــە ڕۆژئـــاوای خەمەکانمەوە فلوتی ڕۆهەڵاتنەوە بژەنی ،بە بریسکەی ڕوناهـت لـە شەوە زەنگی دڵمدا،تۆوی ژیان لە چاوەکانمدا بچێنیت.
ئارامی بە رۆحم ببەخشە لە یەکەم ژوانی ژێـر درەخـتی ڕامووسـان شەڵاڵم دەکەیت بە نیگـا سـیحراوییەکانت خـەیاڵ لـە مەلۆتکـەی هەناسەت هەڵمـدەگرێ و رۆحـم ئـاوێزانی جیهـانی هـێمنی دەکـا ئەفسوس شەهرەزاد گیان دڵ تەنگی زمـانی نییـە دەنـا دڵ هـەرگیز عاشق نەدەبوو،بە تاسەوە سەرنج بدە...
پڕژانی فرمێسکی خۆشەویستی لەو کاتەی هەناسەکان لێك دەئاڵێن پیتەکانی عاشقبوون وشەکانی ئەویـنداریی لـە شـەقەی بـاڵ دەدەن ئەوەی بارگاوی دەبێ ،بە ئارامی لە کەناری بێ ئۆقرەییدا سازشـت

دەکـا، دووری پێوانـەی نـامێنێ ،گیـان بـە زەردەخەنـەت ئـارامی دەگرێ..

ئارامە بە میلۆدی دەنگت ئارامە بە وشـە ئاگراوییـەکانت زۆرجـار هەوڵی تێپەڕینم داوە ،زۆر کات بـازی هـەڵفڕینم داوە زۆر سـات پرسەم بۆ تەرمی عیشق داناوە...!

لـە دارستانی خەیاڵە ئەفسوناوییەکانت دەرنەچووم تێپـەڕ نـەبووم و هەڵنـەفڕیم ،شـینی دابـڕانم گێـڕاوە ،نێچـیرێکی مـەلولم و بـەتیری بزەیەکت دەپێکرێم ڕمی نیگات سەرنجی کـردوم بـە دووکەرتـەوە بەشێکم بەرەو تۆ، وەك ڕوانینـەکانت ئـاوەژووی دنیـای بێـدەنگی بووە

بەشــەکەی تــرم برینــدار بــە شمشــێری فــیراق رۆحــم ئاوێتــەی دنیــای خامۆشــی ئــەبێت ،هــەر کــات مەملەکــەتی بێــدەنگیم دەژاکـێنی و وەرزی پشـکوتنی گـوڵ ئـەدەی لــە هەسـتی بینیـنم، بەچــرپەیەك ئــارامی ئــاوێزانی رۆحــم دەکــەیت، ئەمــە عیشــقە ســنورێکی نییــە بــۆ ڕاموســان ،دەنگــت ئــارامی ڕۆحــە وەك تینوێتی بیابانە باران شەهرەزاد گیان..

# بێدەنگی نیشتیمان



دەمەوێ لە سنورەکانەوە بدوێم
دڵم نایە بێدەنگی ئەو چەکانە جێبهێڵم
ڕۆژانێ بوو، لە سەر مێزی نەیارەکان
مەست دەبوون...و
پاشان بەیەك دەڕشانەوە
لە بێدەنگی دەشتی هەپرونی نیشتیمان دەڕوانم
ئەستەم بتوانم هەڵبێم...!
هەنگاوبنێم ڕازی بێدەنگی شەهیدەکان وەلابنێم...!

**پێ نەگەشتن**

وەسێتنامە بکەنە قاچی قەلەڕەشەکان
دڵم نایە بێدەنگی سەر بازە سەرمەستەکان
بەعیشقی نیشتیمان فەرامۆشکەم...
دڵم نایە، لەوسەرکردانە ببورم
ڕق و تۆڵە و هەڵپاچینیان نمایش دەکرد
بۆ بێچوی لانەی ناودارستان
لە شەبەنگەوە تا وەسڵی خۆرنشین
لە قەلەڕەش و سەرکردە خۆش نابم
مەستی بێدەنگی بوون ...!
کاتێ گرد و لوتکەیان کرد بەگۆڕستان
هیچ، خۆش نابم و نابورم

## دارستانێکی بێدەنگ



چەندبێ نیاز ڕاگوزەرم پەیامتدا

وەکو هەوور بە ئاسمانی ڕۆحی مندا سەفەرتکرد!

بارگاویت کردم بە وشەی عیشق

چەند جوان پیام تێپەڕ بوویت

لە باخی گوڵستانی ڕۆحت وەختە فەنا بووم

بویتە بریکاری دڵم و

کڕنوشبەری ئیلهامت بووم
چەند بێ نیاز گوزەرم کرد...

ڕووەکی وەفات چاند ، لەم خەرابستانە
وەلێ قەدرگرانم...لە دنیایی بێدەنگی دا
نا ئومێد هێواش ...هێواش سەفەرم کرد
کە ، ڕووام تاسپێدە تیماری برینم دەکرد

زۆر بوو...
ئەو دار گێلاسانەی ڕیکلامی هەلۆەرینیان دەکرد
ئەو دار سێوانەی بۆسۆی هەلەبجەیان لێدەهات و
زۆربوون، ئەو خاك و نشێوانەی
گەرمایی گەرمیانیان دەبەخشی و
بۆنی بێدەنگی ئەو گولانەم دەکرد!!!

بێتاقەتیم ، لە ژورێکی بێ ڕۆشنایی
بێدەنگی بوو، سەمایی دەکرد
بێ ڕەنگیم وەك گولێ ئینجانەیەك قەتیس مابوو
لە یادەوەریەکانی ژنێکدا ...!
لە بێدەنگی یەکانی دایکم دەچوو
گوزەری کرد
لە ئەرشیفی نهێنیەکانی دایکم دەچوو

چێژ بەرِۆژەکانی منداڵی
لیمۆ بە بۆنی خەم کەتانی و
دڵ بە داوایی زەردەخەندەی هەنار و
ئاسمانی چاو، بە کاڵی
ئاخ، لە حەزی تێك شکاو
وای منداڵیم چەند دەرد بوو...!

لەم دارستانی بێدەنگی یەدا
هەڵوەدایی ئەو دارانە بووم
عەودالّی ئەو گولاّنە بووم
بە قەیرەی نێژرابوون !
بێ ئومێدی لە ڕوخساریان دەدرەوشایەوە
گوزەشتم کرد ،گاگۆلکێم بە دلم کرد
چاوم بۆ نیگایی گەڕیدە و بێدەنگیم
لە خەم ئاوێتە بوو
ڕوبارێکی یاخی دواسەرنجی هیواکانی
سەرگوشتەی تەمەنی هەپرون..هەپرون کردبوو

نامۆیم دەی نالآند...!
لە تەنیایی تەنیاکاندا کز دەسوتام
خۆم پێی ووتم !
هۆ...ڕێبوارە عاشقەکە
سەرمەستی ڕێگا وێڵی چاو مەستەکە
بێ نیاز ، گەیشتویتە یەقین
گوێ بەدەنگ و شکڵی جەفا نادەی
لە دنیای فەنا سەدان خەونی لە دەست چووی هەیە !
تۆکامیانی...؟
بێدەنگی تولّی کێشاوە
بەرەو قاقرە هەنگاودەنێ ، لەوەرزی داخستاندا
تۆ،کام گوڵ و کام خەیاڵ و کام شەماڵی ئێوارانی
هۆ عاشقە سەر مەستەکە...
لەم ڕەزی تەنافەدا بەرسیلە ئاوپرژێنی ،کەپوو ناکا
هەر وەك شەراب دەچنەوە،
مەستانە حەیرانی مەستی دار مێوەکان !
هۆشاعیرە سەر مەستەکە...
عاشقی گیان تەزیوو
بە وەرزی بێدەنگی گوزەر دەکەی
بە ساڵێکی بێ وەرزدا
بەچاوێکی بێ ئەشك دا

**بە ئاهی دڵنەوایەکی غەمباردا**
**هێواش ...هێواش گوزەر دەکەی**
**بۆنیشتمانی بێدەنگی**
**بەرەو سنورەکانی**
**ڕۆحی ژنێك گوزەر دەکەی  ڕێبوارە عاشقەکە...**

# پرچ وخەیاڵ



وەك موسافیرێكی بێ نشتیمان
هێندەی تولّی مەراقی ڕۆژەكانی بێ تۆیی
سەفەرمكرد !
سەفەرێك هەڵپڕوسكاو
بە سەرابی خەندەكانت
چەندین جار دەكەوتمە نێو گیانی بێ تۆی
چەندین جار لە بێدەنگی غەرق بووم

لە تەنیشتت ، لە ناو خەونەکانتدا ڕاکشام
لە نێو نوێنی ژووری تەنیایت ڕاکشام
تاڵە تۆراوەکانی پرچت زنجیان کردم
هەموویانم کۆکردەوە
بەوانەی بەردەم ئاوێنە و
ناو پەلکی شانەکان و ناو تەسریحە و تێکڕایی لەفەکانم کردەووە
دوو توێی خاولی و بەسەر پۆشەکەشدا چوومەوە
بە وشەی نهێنی دووام بۆیان هەمویانم لێکردەووە
کردمە نێو پریاسکەی هزرم
لە بێدەنگی ژووری تەنیام خامێك هێندەی بالأم ڕاخستن!
تاڵی پرچ وتاڵی زووڵف وتاڵە لاسارەکانم جودا کرد
ئەو تالأنەی لەگەڵ خەما بەر(با)دران
ئەوتالأنەی لەلا لێودا،
بە مابەینی ددانەکان بڕان
تاڵی شانەی وەلانراو
سەرتاڵی سوتاوی بەجێماو
هەموویانم ڕێکخستەوە
پرچی گەش ،لە شەقەی باڵی دا و فڕی
لەئاسمانی بێدەنگی دا، گوزەری کرد

فڕی فڕی دنیایی خەیاڵی بەجێهێشت
بۆ ئاسمانی خەون فڕی
تاڵە خاوەکانی پرچ و
پیتەکانی ناو تێنوسی شیعرم فڕی
دایان لەشەقەی باڵ
وەك کۆترێك بۆ دنیای خەیاڵم فڕی...

## بەئیزنی (کاروان عومەر)



گلۆپە کە دەکوژێنمەوە

با...ئا وێنە کە

بە ڕووتی نەت بینێت!

ستیانەکەت

لە ژێر پشتێکەم دانێ

مەهێڵە بزانم

چی لە بۆنی

شەمامە خۆشترە ؟

لە شەودا

گلۆپە کە دەکوژێنمەوە

نەبا...ئا وێنەکە

وێنەی مروارییە

ڕژاوەکانی جوانیت و
ماچەڕەنگا و ڕەنگەکانمان بگرێت...

تابلۆ
هەڵواسراوەکە
هەڵدەگێرمەوە
نەبا...پیرەمێردی ناو یەختەکە
بمان بینێت
یا ...ماسیەکان
یان نەورسێك
یان قرژاڵێك
لەدرزی تابلۆکەوە
سەیرمان بکات !

لە بالکۆنەکەدا
بەتانیەکە دەتەکێنم
هەتا...تاوسکەی ناوی دەفڕێت
تۆش پەنجەرەکە دابخە و
پەردەکەش دا بەرەوە
من ،دڵم لە خۆشم پیسە..

:– جارێك بۆ دڵم
جارێك بۆ گیانم
جارێكی تر...
بۆ دەستەكانم
بێقەرار بووم
بەدەنگی بەرز بۆ ئاوێنە و
بۆ تابلۆی ژوورەكەم و
بۆ گوڵی بەتانیەكەمم خوێندەوە
بە شەمامەم گووت:–
برۆ لە پەنجەرەی بالكۆنەوە بچۆرە ژوور
بۆنی پەنجەكانی بكە!
تێنوسی
پشتیەكەی (كاروان عومەر) هەڵبەرەوە
لە بۆنی تۆ،خۆشتر هەیە !
لە شەودا شەمامەگیان

پاشان ووتم :–
ببورە لێم...
هێندەی شەپۆلی دەریاكان ببورە
ماسیەكان...
قرژاڵە چاو جوانەكان
نەورەسە عاشقەكان

پیرەمێردی ناو تابلۆکە
لێی ببورن...
ئەمە دڵپیسی نی یە
پەیامی خۆشەویستی یە
چونکە ،تاوسی ناو بەتانیەکەی هەڵفڕاد !

پەنجەرەکە دابخە و
پەردەکەشی دادرەوە...
نە با...
(با) پەی پێ بەرێ
تابزانێت
ڕۆژی چەند جار خۆشی دەوێت...

# ئێوارانی سلێمانی



گیانە  دوورە وڵاتەکەم

بەکاتی بێدەنگی ئەوغوربەتە

لەژوری تەنیایی ناختەوە

ئێوارەی سلێمانی

هێندەی گەڵای دارەکانی

پێتان دەڵێین غەریبی باش...بەداخەوە

شەو ئاوێتەی سۆزی هیجری موغانە

ئەستێرەکان سەمفۆنیا بەرۆح دەدەن

خۆر نشین گوڵەکانی باخی گشتی

بۆ ئێوارەی میهرەبانی کڕنوش دەبەن

هەناسەکەم،تەماشاکە
شار هێندەی تر جوانتر بووە
دامێنی ئەزمەڕ و گۆیژە
بۆ عاشق و سەرمەستەکان
بەرگی ئەستێرەی پۆشیووە
ئایی لە نازی ئێوارانی
ڕەونەق ئەدا دنیایی جوانی
دڵ ڕفێنە مەستانەیە
ئاو و هەوای سلێمانی...

# شاری ئەدەب ئاوێزانی
# شەوی یەڵدایە ئەمشەو




لە هەگبەی ڕۆژی کورتی پایزانی
گەڵای فڕیوو
لەسەر باڵی ڕەشەباکەی ئێوارانی سلێمانی...
سەرنج بدە
بەپیتی ناز لێی نوسراوە
منم عاشقی باخچە و کوچە و کۆڵانی
چەند تامەزرۆ!...

خەزانم کردە بیانوو
بباریٚمە نێو ئامێزی خاك و خۆڵی سلێمانی...

ئینجا بڵێ:-
(مەقصەد غیابی نالی) بوو، کە فەرمووی
(چەشمێکە میسلی خۆر،لەسەد جێ بەرۆشنی
فەورانی نوری سافە لەسەر بەردی وەك بلور
یاعەکسی ئاسمانە،لەئاوێنەدا کەوا
ئەستێرەکانی ڕابکشێن ،وەك شەهابی نور)

کە،شەو داهات،لە ئاسمانی ئەم شارەوە تەماشاکە
بلێسەیە،دەجریوێنێ وێنای کاکێشی ئاسمانە...
یەکەم پیتی ئازادی،تاکو ڕەهای کۆت و زنجیر
لەتیانوسی(کاسکێتی پایز) و زاری(ڕۆژانا)بڕوانە...
بێ چەند و چوو پێدەزانی
شاری شاران ،خاکی پیرۆزی کوردانە...

حاجی حان و دەرگەزێن
کارێزەکەی وەستا شەریف،
دارکاژەکانی مامەیارە...
هەتا ئێستاش
تاجی وشەی (پیرەمێرد)یان پێوە دیارە...

به هەورێکی کۆچەریدا،پەیام بنێرن بۆ(حیجاز)
پیت به پیت و وشه وشەی
چامەکەی گەواهیدەرە،سولێمانی که خەمێتی
یەکەم هەنگاوی غوربەت،تاوەسفی عیشقی حەبیب...
ئەمیستاکە،شەوی دەیجوری ئەم شاره چراخانه
سلێمانی ڕەونەقی سمبولی جوانی یه شاری ئەدیب...
سەفەر بکه لێی بڕوانه،له شەوانی
هەرشوێنێ پەی پێ بەری،کۆڕ و مەستی لاوانی
شیعر و بەسته و قامك و سەدای گۆرانی
که،خۆر هەڵدێ له شەبەنگی بەر بەیانی
(بوخاری میسلی بوخوور)له بۆنی میسکی بابانی
تا ڕۆشنکات ماڵ به ماڵی سلێمانی...
هەر ڕەقیبه نیگا دەکا
خۆتی ئەکەی بەقوربانی...
بەقوربانی ناز و مەکری کچەکانی سلێمانی
هەر بەزاری نازدارانی
به ساقەتبم شاری هەڵمەت و قوربانی
ئەی شارەکەم سلێمانی...

# کۆڵانەکانی منداڵی



سەفەرێك، بۆ نیشتیمانی دایك
گەشتێ بۆ کۆڵانەکانی منداڵی
لە، مەملەکەتی بێ تۆیی دا دایکە
حەز دەکەم بگریم !
گریانێ دڵ بکا بەتافەی بەر قەڵبەزە و
فرمێسکەکانم گوڵی ئینجانەی دڵم مەست بکا
گریانێ ئاسمان پێ بزانێ،چلۆن دادەبارێم و
بزانێ هەووری تورەی سەری کاسم
تامەزرۆی ، چ زریانێکە !
دایکە حەزم لێیە ،بەو شێوە بگریم !

دوور لە وڕکەکانی منداڵی
دوور لە هەڵگۆفینی چاوەکانم بە پەنهانی
حەزم لێیە بگریم بۆ بێ ناو نیشانی تەمەنم
ئیتر ئەو گزنگەی جاران نیم
بینایی پڕ بکەم لە ڕوانین و
ئەو سێبەرە نشێوەی ڕابردوونیم
ماندووی ڕێبواران دەربکەم
نە ئێستا ئاسمانێکی بێ تۆی
لە کانگایی ڕۆحی بریندارم بەدی دەکەم
نەهەناسەیەکی بێ ئۆقرە
لە سەر سنگم لێو ڕێژ دەبێ و
نە مەلێکی بەرزەفڕی خەیاڵم
لە کانیاوی هەستم مەست دەبێ
چونکە، حەزم لێیە بگریم...

دایکە سوێند بە گیانت
لەم کەلاوەی نیشتیماندا
بۆنی گوڵی ئینجانەی بەر هەیوانەکە دەکەم
ئێوارانێ شنە دەکا
لەشی شەکەتم بە بینینی،ماندوویی دەر دەکا
سوێند بە فرمێسکی ڕژاو

جگه لە بۆنی ڕێحانەی ڕۆحت
هیچی تر شك نابەم...دایکە
جگە لە کەلاوەیەکی بەسەرچوو
سێ ژوور و داڵانێکی بەرتەنگ
کە،پڕە لە دیدگایی یادگاری قەشەنگ
هیچی وەك دەنگت مەستی نەکردووم
کەس بەتۆنی لاوازی دەنگت بانگی نەکردم
ئیتر داڵانێك شك نابەم بۆ لانکەی بیرە وەری
دەرگایەك نی یە ،بۆ بیر کردنەوە
دەنگێك نی یە ،بۆ وەڵام دانەوە
دڵێك نی یە ،بۆ خەم ڕەواندنەوە

هێندەی بیرەوەریەکانم بیری منداڵی دەکەم
پەنجەرەیەك نی یە ، بۆ کردنەوە
دەلاقەیەك نی یە ، بۆ بانگ کردن و
هەناسەیەك نی یە، بۆ ئەم ژانی سەرە
دایکە بیری بانگکردنەکانت دەکەم...!
ئەم ئێستا...
هێندەی فرمێسکەکانی دابڕان گریاو
هێندەی دڵشکاوەکانی دنیا دڵشکاو
بە ئازارم هێندەی فرمێسکێکی قەتیسماو

**هێندەی ڕەهێڵەی تەمەنێکی لـە هیـچ چوو**
**بەژانەکانی تەمی ڕۆژگار ،بینایم لـەدەس چوو**
**ئیتر نیشتیمانی سەرابی خۆزگەم**
**بۆ ئەبەد بوون بە خەونێکی خەیاڵی ڕابردوو...**

# نامەی چوارەم



شەهرەزاد گیان سڵاو، باش دەزانم وەکی باقی نامەکانی تر ،ئەم نامەشم ناخوێنریتەوە ،ئەدی سڵاو ڕۆژێ دادێ لەسڵاوی هەناسەساردی من دەگەی و بەم نامانە ڕۆژگاری ساردت گەرم دەکەیتەوە ،گەرچی نازانم چۆنیت ،بەڵام گیانم لە دڵتلیەو عیشقێ بە تۆوی ڕۆح چێنرابێ بە فرمێسک پاراو بوبێ سات لە دوای کات بە میسکی هەناسەت ژیابێ ئەبێ چۆن بێ...!

باشی من لە نرکەی ئەو پیرە دارە ئەچیٚ،کە بای پایز گەڵاکانی ئەوەریٚنیٚ ،هەموو نیٚوەندی هەفتەیەك ڕۆژێکم داناوە ،لە تلقەتی بیٚ ئۆقرەی تیٚدا بەهەدەربدەم و بۆ یادیٚکت سەرلە مەزرای ستوی دڵم بدەم ،

ئەم بەیانییە ڕاگوزەریم بەو شەقامەی پیٚکەوە بۆ ژوانیٚ پیٚیدا تیٚپەڕ بووین ،پڕ بەدەنگم بە سەر گوڵی باخچەکاندا هاوارم کرد ، من شەهرەزادم خۆش دەویٚ ،جگە لە خۆم کەس گویٚی لەدەنگم نەبوو ،جگە لە لاشەی شەکەتم کەس هەستی بەناڵەی گەرووم نەکرد ،ئەو دەنگە بەرزەی ناخم هاواری دڵم بوو دڵم.

جار جار بۆ سەرقاڵ کردنی دەستەکانم فرمیٚسك لەچاوەکانم دەهات ،نەم ئەزانی ئەمە(بیر کردنە یان لە بیرکردن )ئەم فرمیٚسکانە دلۆپ دلۆپ چیٚژی خۆش بەختین یان ماڵئاواییی،تا چەند لە دڵ تەنگیم دەگەی...؟

وەك لاواندنەوەی پەپولە بە نازو مەکری گوڵ یان وەکی چرپینی بولبوڵ بۆ ئازادی و بۆگەڕانەوەی سروشت و ئاویٚزانی نامرادی ، زەمەنیٚکی دوورو دریٚژ لە پەشموردەی خەندەکانت بیٚ بەشم ،وەکو مەلیٚکی لانە شیٚواو بەدوای ماڵی دڵی تۆدا ویٚڵم ،وەکو ماسییەکی کەنار دەریا سەرگەردان و هەڵوەدای قوڵایی دڵی تۆم.

گەرچی ئەم نامەیەم وەك نامەکانی تر، جگە لە دەردەدڵی و لە سیٚدارەدانی کاتەکانم نەبیٚ بەدەستی گومانی ناوسەرم دەزانم ناگەن

به (تۆ) و ناخوێنرێنەوە،کاتێ زەوی پاراو دەبێ چ باکی بەهەوری زستان هەیە ،کاتێ دەریا پڕ شەپۆل بێت ،چ باکی بە وشك بونی کانی هەیە.

ئەم وشانە گەر دەرنەبڕم دەم بڕن ،دەمەوێ ئەوەبزانی دوێنێ لای ماڵە چۆڵەکەی من باران بەنازتر دەباری ،ئەرێ لای بەر پەنجەرە نسرمەکەی ژورەکەی تۆ هەووری گریانم دەباری..؟

بەچێژی ئەو بەیانیەی ،کەباران هەردووکمانی تەڕ کرد،بۆی ڕاوەستام جوڵەم نەکرد هەستم دەکرد ،چەند زیاتر تەڕبم باشترە، چەند دلۆپ زیاتر بەر سەری کاسم بکەوێ بەعەشقی تۆ وا باشترە ،گەرچی بۆی چوومە ئەو باخچەی یەکەم ماچمان تیداکرد ،فرمێسك و بارانم تێکەڵ کرد ،نەم دەزانی پێبکەنم یان بگریم...!
پێبکەنم بەو شێتیەی ناوی عیشقە و بەنیگایەك دەمان کوژێ ،یان بگریم بۆ دڵی هەزاران جار شکاوم لەم مەملەکەتی فەنابونەدا ، ئەوەی هەموو جارێك پەیوەستم دەکات بەتۆوە،ئەو لێك چونەمانە بەدڵ شکان هەتیوێمانە بە پەناگەی نسرمی گریان ،نامرادییە لەژیان و خۆشویستنە بە نیگایەکی چاوی تۆوە ژیان کردن.
شەهرەزاد گیان نایشارمە زۆر گەڕاوم ،وێڵم بەدوای هەناسەتدا،بۆنی تۆ لە هەر کۆڵانێکی شاربێ لەوێم ، شوێن پێ کانت ،لەهەر شەقامێ بەدی بکرێ من ڕێبواری سەرەڕێم ،گەرانێ بۆت دەگەڕێم وشەی گەڕان سەرسام بووە بەگەڕانم عەودالم و

،کوچەکانی چاوەڕوانی دەگەڕێم،گەڵا بە گڵای هەڵوەریوی دەستی خەزان،لەناویدا بۆ ناوی تۆ دەگەڕێم.
شـــەهرەزادگیان ماوەیەکـــە دێتـــە خـــەوم دەڵێیـــت هـــاتووم نارۆمەوە،بەڵام دوێنێ لە خەونێکما لەناو باخێ ڕامان ئـەکرد ،وەك ئەوەی پێشبڕکێ بکەین بۆ لێکردنەوەی گوڵ بۆ یەکتر،یان دەستەمل و باوەش کردن و لێو بۆ لێوی یـەکتربردن بـەڵام لـە پـێش چـاوم وون بووی بـە پـێ خاوسـی زۆر گـەڕام بـۆت ،کەچـی هـەر نـەم دۆزیتەوە ،ئەم خەونەم بۆ خەو زانێ گێڕایەوە،
ووتی:-(ئەو لە بیرت ناکات،ڕۆژێ بۆ لات هەر دێتـەوە،وای ئـەو ڕۆژە تا ئێوارێ کە دڵ خۆش بووم )
بیرکردنێك بیرت دەکەم ،دایـك بـیری کۆرپـەی نـەکردبێ..بیرت دەکەم وەك چاوی کوێر بۆ بینایی لێوی وشك بۆ تەڕ ئاوی ،
لەوەش زیاتر بیرت دەکەم،کـە بـە بـیری زینـدانێکی هەتاهەتایـدا نەهاتبێ،هێندەی هەموو غەریبانی دوور لە سۆزی کوچەو کۆڵان و شار بیرت دەکەم ،
شەهرەزاد گیان ناوی تۆ چ خولیایەك بوو،لەقەڵبەزەی شیعرەکانما ،هەرناوی تۆ،لەئیلهام و خەونەکانما هەر نیگـای تۆ،هێنـدەی تیـری ڕەشی چاوەکانم خۆشم ئەوێ ،هێندەی بـاران بـۆ بیابـان هێنـدەی پێکەنینی دوایی گریان خۆشم ئەوێ،
حەزم وابوو هـەموو ڕۆژێ بـەیانی باشـت لـێ بکـەم ،بـەگوڵێکی نەوبەهاری ڕۆژەکەت لێ شـاد بکـەم ،حـەزم وابـوو ،بـە پەنجـەی شیعرەکانم پەرچـەمت بـۆ شـانەکەم گـوێ لـە ڕازی دڵـت بگـرم ،پێکەوە ماڵئاوایی لە خەم بکەین گەر چـی زیـاتر خۆشـم ئـەوێی هەرچەند دووربیت...

# کۆدی وشـه




هەموو شوێنێك

ناوی لیّ دەنێن نیشتیمان

زێدی من یەك شوێنە (دایك)

هەڵدەوەریّ گەڵای درەختەکان

خەزانە سەر گوشتەیان قسەی هیچە...!

بەهارە و عاشق بووە...پایز

بێدەنگیت وەرزی تەزینە

لەڕۆحمدا هەڵیکرد و

بومە شەختە و دڵم بەستی..! بەفر

به هەموویان ناوتری
بێجگه له تۆ ،له گوڵ دەچی..! گوڵ

به هار و پەپوولە ئاوێتەن
بەچەشنی بەفرو زستان
تولّی ژیانم بەهارە پەپولە گیان... پەپولە

عیشقێك لەناخمدا هەناسەدەدا
سەدان فرسەخ لە مردن دووری خستمەوە
ژنێك لە ڕەنگی ئاو
ئەوە تۆی.. عیشقی شەهرەزاد

جەخار ئەو زەك و لقه سەوزانەی شیعرم چی یه ؟
له شەبەنگ ڕانامێنن نوێژی ستایش
بۆ هەتاو نا...!
بۆتۆی دەكەن... ئیلهام

دڕندە ترین زیندەوەر مرۆڤ دەبوو
ئەگەر عیشق جەنگی بەرپانەكردایە...لەو نێوەندە خۆشەویستی

گەمژە ئەو سەربازانەن
لە دوای کاولکردنی شارێك،ئاهەنگ دەگێڕن...
منداڵەکان، بە دوارِۆژی نیشتیمانێکی فرۆشراو
قاقا..پێدەکەنن... کاوێژی سەرۆك

هەموو جارێ کە پایزدێ
لە پێش دا،پەیام بۆ پەلکی دارەکان دەنێرێ
نەکا ،لەناکاو دەرکەوێ و
کەس بەرگەی ئەو هەموو تەنیاییەی نەگرێ... خەزان
لەگەڵ رِۆحتا سەفەر بکە،
رِەشماڵی وەرزی بێدەنگیم هەڵداوە...!
شەهرەزاد

دەستی گوڵی گرت
گوڵ بوو پەنجەی گرت
تێکرِا هەردووکیان خونچەیەکیان چێکرد
عیشق و شکۆفە،ئاوێتەی یەك بوون
بۆ دڵی بیمار هەڵگری خەم بوون
گوڵی ژالەهات پایزی جوانی
وێنای بەهارە بۆ کامەرانی...

هات پێی گووتم
وەرە بڕۆین، بۆدیداری ئینجانە وگوڵ
با بچینە حەوشەکە یان
پەنجەرەیەکی هەیە بۆسڕین
لە شوێن نەخشی پەنجەکانی
شوێن پێ کانمان بنەخشێنین
ئەو پێی گووتم ...نمەی باران

# گـەڵا



بەپێ خاوسی هات چرپاندی

چاودابخە وەرە بڕۆین

ئەبارێینە حەوشەکەیان

یەکەم عاشقی خەزانە

دووەم پایزی خۆش دەوێ

گەڵای داری حەوشەکەتان

ئا..پایز گوتی...

ئیستاش کە دێتە دیدارم
بۆنی ئازیز ترین مرۆڤ دەکەم
با هەڵ دەکا...!
کە دا دەکا،حەزم لێیە
هیواش..هێواش لاشەم تەڕکا
چونکە بۆنی ئەو
زامی دڵم دەشواتەوە... باران

# نامەوێ بڕۆم



دادی بێدەنگی دەمکوژێ

قوتابیەکی خراپم

وانەی دابڕانم خوێندوە...

بەبێ خاوسی بەوەرزی تەزیوی ڕۆحتا

لە دنیای بێدەنگی،خەلۆەتم فێرمەکە

مەمکە بە مسافیرێکی بێ لانە

چونکە ،مەستانە بێ لانم...

کام سەیرانگا ،لە هەر شوێنێ
چێژی سێبەری دارەکانی
قەرەدا خ و دووکان و چەمی ڕێزانی گرتووە
کەی یۆنان و کەنار دەریا
کەی ناو باخ و تاڤگەکانی سربیا
چێژی سروشتی گۆیژەیان هەیە
کام دیمەنێ...!
هێندەی جوانی سلێمانی
هەوای پاك و گوڵەکانی نازیان هەیە
ئەمەوێ نەڕۆم !

# عیشق



سەرسامم بە دابڕانم ،لە خەم
ڕەنگ زەردیم بە خەیاڵەکانمەوە
وایی لە عەرشی دابڕان لە بێ ڕەنگیم
خەیاڵەکانی توشی نەزیف کردم
ئەو هەموو بێ ئومێدیەی ژیانم لێ دەچۆڕێ
بە خەمزەی چاوەکانی
ڕەگی خۆشەویستی لە دڵ هەڵچەقاند
بە ژیان ئاشنایی کردمەوە
فریاد ڕەسی عیشق تۆی...

# جوانی



نەرم نەرم ڕێگا دەکەی
وەك پەپولـە سەما دەکەی
پەنجەکانت پەیام بەخشن
دنیای شیعرم شەیدا دەکەی

هەواڵی  تۆیان هێناوە
لـێوت خەندەی لـیّ دەباریّ
زوڵفت شکۆفەی پۆشیوە...
شەبەنگ،لـەگەڵ نیگا کانتا
جوانیان ،بە گوڵ بەخشیوە...

پەپولەکان پێیان گوتم
هەرچی جوانی باخچەکانە
لە ڕوخساتا بەدی دەکرێ...
نازناز و گوڵی شەونم
لە حزورتا کڕنوش دەبا
سروشت بۆ جوانی تۆ دەمرێ...

بابڕوا ..ئیتر
دار هەنار گوڵ ناوەرێنێ
بابڕوا ...!
خەزانی باخچەی تەمەنم
هەست بەلێدانی دڵی ناکا
بابڕوا...!
یەقین چۆتە چاوەکانی
نازانێ دووری چی یە،تەنهای چی یە

بابڕوا..
ناگاتە بەهار گوڵی دەستی هەڵدەوەریێ
منیش ئەوکات ،کەهاتەوە
هەستی بۆنی گوڵم نامێنێ!...
بابڕوا
تازە فێری ڕۆشتن بووە
منداڵ ئاسا بیانوی ڕۆشتنی گرتووە

بابڕوا...
من ئیتر ...دەرگایەکم نی یە بۆ کردنەوە
وشەیەك شك نابەم، ئاهی دڵی پێبدەمەوە
با بڕوا...ئیتر با بڕوا

# نامەی پێنجەم



سڵاو گیانەکەم چۆنی ،پێدەزانی بێ ڕەنگیم دووری تۆیە ،وەرزی بێ تۆی بەڕێ دەکەم ،وەکو ئەو ساڵانەی لەتەمەنمان ڕۆشت بەم نەوبەهارە زۆر دڵ تەنگم ..! جگە لە بزەو خەندەی دروستکراوی ڕوخسارم ،کە نمایش دەکەم هیچ ڕوناهی لە ڕۆحمدا نی یە ،جگە لە وەرزی دڵتەنگی و دنیایی بێدەنگی لە ئاسمانی ڕۆحمدا، هیچ یاداشتنامەیەکم نی یە، وای لە هەووری بێقەراری دڵم لە چاوەڕوانی کزەی هەناسەیەکت، وای لەبارینی ئەشکی چاو،جگە لە هەورەتریشقەی بیرکردن،لە ڕاموسانی بیرەوەریەکانت ئەم بارینەی تاوی ڕۆحم ئاستەمە هاوینی بێت هێندە دەزانم ،لەگەڵ

تەنیایی خۆم دادەنیشم و بەس بیر لە تۆ دەکەمەوە ،زۆر لەوە زیاتر بیرت دەکەم ،بەبیری هیچ کەسێکدا نەهاتیێ شەهرەزاد گیان.
هیچ کات هێندەی ئێستا بیرم نەکردویت ،بەردەوام خەیاڵم دەکرد، مرۆڤێکی بەتوانام ،لە ئاست ئەڤینداری بەهێزم و ناکەومە داوی سۆز و نازی نیگات ،

هەمیشە لەدوایی ژووان و یەك بینین بەخۆم دەگوت :- ژیان بەردەوامە خۆ ڕاگربە تەنها جاریێ خۆت تاقی بکەرەوە بزانم چەندە بەرگەی دووری دەگریت..؟ هەر بە پێکەنینەوە دەمگوت :-چی یە زۆر ئاسانە گریمان لە بیرم کردووە، زۆر جاریش دەمگوت وابزانە هەر نەتناسیووە،
ئەو کە بتوانیێ وشەوشەی ئەم عیشقە ،عیشقیێ لە سەرگوشتەی ڕۆحدا چۆکەرەی کردبیێ ،عیشقیێ توانایی لە بیر کردنیت نەبیێ ،ئەو هەموو یادگاریانەی وەك نیگارکێشێك بەشیلەی لێو و بە پێنوسی لێك ئالآن تابلۆی ژیانمان پیێ ڕەنگ کردبیێ لە تێنوسی تەمەندا،ژوانێك هەردەم بەنوسینەوەی سەدان یاداشتنامە هەر لە سەرەتایی دەست گرتن بیێ دەسپێکی یەکەم نیگا بێت، نازی ئەو هەموو خەندەی لێوە ،کە نەمتوانی وەك ڕۆمانێك بیخوێنمەوە ،
سەرنجی ئەوچاوانەی وەکو ماسی لە دەریایی ڕۆحمدا وێنایی دەکرد ،ئەوچاوانەی هەرساتەو ڕەنگیێ شێوازێك ،کە بەبیری هیچ

شاعیرێکدا نەهاتووە وێنایی بکات و هیچ نەقاشێك پەی بەڕەنگی نابات و دروستی بکات،
قەتیش بە ژێی هیچ مۆزیکسیانێکدا نەهاتووە، ئاوازی دەنگی لە هەوا بچڕێ و هەروا بەئاسانی لەبیر ناکرێ و بەردەوام وامدەزانی وەك پۆشاکێکە،دوای ماوەیەك وەبیرمدا نایەتەوە ،یان هەروەکو کەل و پەلەکانی یاری کردنی کاتی مندالّیە و گەورەبووم ،
بیرم دەچیتەوە ئایی چەندە درۆی جوانم لەگەلّ خۆم کرد..! بۆ لە بیر کردنت.
ببینە ئیستا چۆنم چەند شپرزەم بۆ دیدارت شەهرەزاد گیان..
ڕوانینەکانم پڕبوون لەبێ تۆی،خەوشی ئەو سەرنجانە دەکەم ،لە ڕەنگی تۆ دەڕوانیێ و بۆنی ئەو گولّانە دەکەم لە ڕاستی دا دەچنەوە سەر بۆنی پرچی تۆ ، دەمخەیتە کەناری خەیالّێکی سەر کەش و دەیان جار لە دەقێکی نەبیستراودا ،ناوت دێنم دەمەوێ
ئا ..دەمەوێ دەرۆزەی قاموسێ بکەم بۆ لە بیرکردنی پیت بەپیتی ناووت ،دەیان جار پەنجەکانی دەستی نوسینم گەستووە سەدان وشەی نهێنیم بۆ پێنوسەکەم دڕکاندوە ئیتر دیلی ناوت نەبم ،
بەلّام چی لە دلّم بکەم لە هەزاران سەرەڕێی غەریبان وێلّبم هەر دەمخاتەوە، بیری تۆ لەسەدان خەیالّی بێ تۆی هەلّبێم ناو و ڕوخساری تۆ و نیگای تۆ دەچێتەوە یەکەم وشەی نوسینم..

لەم کۆڵانە بێ دەنگەی ئێمە ،غەریبی  بێ تـۆی بنۆشـم حەزناکـەم
،لـە مـاڵ بچـمەدەرێ، جـار جـار بـۆ وەرگـرتنی هەوایـەکی پـاك
پەنجەرەکە دەکەمەوە و هەست بە بۆنی هەناسەت دەکەم،
ئەوشـەماڵەی لەکوچـەکانی تـەنیایی تەمـەنم هەڵـدەکا ،سـڵاوێکی
ئەفسوناویت بۆ دەهێـنن ،نەکـەی سـەرهەڵبڕی و پـەی پـێ بـەری
لەئاسماندا وشەکانم پیتەکانی شی بکەیتەوە ،ئەزانم کە نـاتوانی ڕازی
دڵـم بکەیتەوە ،ئەگەر هەوڵ بدەی  و تەماشایی خەونێکی منـت بـۆ
ناکرێ ...
کەناوی منت بیر کەوتەوە چاوت پـڕ دەبـێ لـە ئەشـك و نـاتوانی
تەماشای خۆر بکەیت ،چـونکە وابڕیـارە لـە بـری تیشـکی هـەتاو
ماچت بکەم ،ئەها بیرت چوو پێم دەگـوتی بـەغیلی بـە هـەتاویش
دەبەم ،لە من زیاتر ماچت بکا ،لە بیرت چوو پـێم دەگـوتی غـیرە
،لە  با دەکەم ،کە زوڵفت شانە بکا .
تۆش وەك من وابە ،گوێبیستی شڵپ و ناڵەی پێـی بـاران بویـت ،
بەبێ چـەتر وەرە دەرێ گـوێ ڕاگـرە و چـاوەکانت دابخە،سـەرەتا
گوێت لە چرپە چرپەی وشەی نەبیستراوە،
جار بەجارێ نمەیەك شاڵاوی ماچت بۆ دێنێ بـۆ ئـەوەی بێـدەنگیت
لەبارچێ ،خۆراگربە و بە هێواشی بۆنیان بکە ،ئینجـا لـە چـپە دەر
دەچێ  وای لەقاقای باران و وای لەڕەوتی ڕەوەئەسپی تاوی بـاران
،گوێ ڕاگرە شڵپ و هۆڕە و حیل حیلێن و ئاوازی باران ببیستە.

شەهرەزاد گیان ڕۆژەکانی بێ تۆیم وەها لێ ڕۆشت دەستەملی باران بووم ،بۆ ساردکردنەوەی دڵم بۆ هێمن کردنەوەی دەمارە پڕجۆشەکانی لاشەم دەبوو بۆنی باران بکەم،بۆشەپۆلی هەستەکانم دەبوو نم نم بارانی عیشق ماچ بکەم،
گەرچی هێندەی مەلێکی ناو قەفەز بۆ ئازادی خۆشم ئەوێ ،لە دڵۆپەی بارینی بارانەکانی تەواوی ئەم وەرزە زیاتر خۆشم ئەوێ،شەهرەزادگیان بۆنی باران پرچی تۆ ..لەکەمەری ئەم کۆڵانە سەردەرناکات و ئەم برینی بێ تۆیی یە سارێژ ناکات ،ئەگەر بەبیرتاهات خانەقایی دڵی ڕوخاو و ڕۆحی تەزیووم بە دووری نیگاکانت ببینیت ،بێ ئەوەی ڕوو وەربگێڕیت و تەماشایی ڕابردووت بکەیت وەرە ،کاتێ وەرە بەر لە دەرچونی گیان و کاتێ وەرە ژیانم لێوان بوبێ لەدەرچونی گیان و کاتێ وەرە ژیانم لێوان بوبێ لە مەراقی بێ ئۆقرەی کاتی تینوێتی وەرە بەر لە ئاوابونی تەمەن شەهرەزاد گیان وەرە.



بانگم مەکە!
دەبا خەیاڵ ئیشی خۆی کا
دەنگت کپ کە!
لاشەم بێ گیان گوزەر دەکا
سەردەمێکە تێکشکاوی
جەنگی عیشق و دابڕانم...
سەردەمێکە هەڵتوتاوی
بەرلێزمەی دابڕانی دڵدارانم...

لێم گەڕێ بامەستانە بم
خەمێکی قوڵ کەلەپچەمە
ئەوەی لە ڕوخسارما دەبینی
بەراورد بەشکانی دڵ
شەهرەزاد گیان، هێجگار کەمە
دەشێ ئاسمان ،پێ بزانێ
چەند ،تامەزرۆی بینینی تۆم
دەشێ ڕۆحم  پەی پێبەرێ
شاهیدی شکانی دڵی خۆم

نزام ئەکرد لە ژێر باران
گوزەرێکت ،لەگەڵ بکەم
تۆ دیارنیت و بڕیارم دا
پەنجەرەکەی لێ دابخەم

لێم بڕوانە
نەخۆشی، نەخۆشخانەیەکم
بە شەختەی دڵت تەزیووم
بێدەنگیت، پەتایی کوشتنە
هاکا...لە پێش چاوت وونبوم

# جەنگ



من دێم بەدوتا دەگەڕێم

تۆ هەواڵی من دەپرسی

ئەم بێدەنگی یە ،لە بار دەچێ

کێ دەڵێ جەنگ هەموشتێکی ناشرینە!

با جەنگ ڕوو بدات

عاشقەکان ڕەنگیان سپی هەڵدەگەڕێ و

دڵە کوتێ خەویان لێ حەرام دەکا

عاشقەکان دەجەنگن

بۆ عەشقی نیشتیمان

بۆ پرچی کچێکی چاوکاڵ

عاشقەکان

کۆڵانەکانی منداڵی جێناهێڵن

با جەنگ ڕووبدات

جەنگێك دڵی کەسی تیا نەشکێ و

باڵی پەپولەی تیانەدڕێ !

# بارین



برۆ گوڵم هەموو ڕۆژێ
بەهەورێکی کۆچەری دا
نیگاکانم دەنێرم بۆت
لەئاسمانی حەزەکانتا
وەکو باران دەبارێم بۆت
بۆنی گوڵ و هەناسەم
ئێوارانێ ، لەگەڵ (با)دا
هەڵدەکا بۆت...

زوو زوو وەرە حەوشەکەتان
سەرهەڵبڕە، لێم بڕوانە
جارناجارێ لێوم دێنم
لەگەڵ تەوژمی بارانا
ماچی دەکەم، گەردنی گەش
لەگەڵ نازی ئەو چاوانە
حەزم وایە، عیشق وایە
گیانم ئالودەی ناخت بوو
لە سەرەتایی کەم ژیانە
لەئیستاوە بیرم کردوی
ئیلهامی شیعرم بیزانە..

## پەشیمانی



داخی داخم...

لە باوەشی گەرما نیت

نازی پەنجەکانت بکێشم

لە ناو پێخەفی شەوما نیت

ئازارت لەگەڵ بچێژم !

لە سەر سەرینی تەنهات نیم

چیرۆکت بۆ بخوێنمەوە...

گەر سەرمات بوو
پێخەفەکەت پیا بەمەوە

پڕ بەدڵم خۆزگەم دەخواست
وجودی من لەلات بوایە
لە جێی هەوا
هەناسەتم هەڵکێشایە
بۆتینوێتی زاری وشکم
ئەشکی چاوتم بخواردایە
خۆزگەم دەخواست
وجودی من لەوێ بایە...
بە یەك وشە ،لەگەڵ تەوژمی سپێدە
بەیانی باشم ،لە چاوانت بکردایە...

بەئەسپایی بمگوتایە:-
ئەمڕۆ زیاتر
لە ڕۆژانی ڕابردوو زۆر تر
دڵی خۆمت پێ ئەبەخشم
خوشەویستم هەستە لەخەو
واتێپەڕ بوو نەماوە شەو
وەرە شەوگار تێپەڕێنین
ڕۆژێکی نوێم بۆ بێنەوە...

چاوەڕوانم هەموو کاتێ
دەرگایی خۆشم بکەیتەوە...
داخی داخم تۆ لەلام نیت
تابیینی چۆنە ماڵم...
وەکو سەراب ڕاگوزەریم
تەنها جارێ سەربکێشە
تابزانی چۆنە حاڵم
تۆ لێرەنیت تابیینی
خەم بۆتە پێناسەم و
تەنیای بۆتە وێنەم و
ئازار کفنم بۆ دادەدڕێ
لە پێش چاوم حەزەکانم
بە هێواشی بۆ خۆی دەمرێ

داخی داخانم لەلام نیت
بەس ئەم جارە وەرەلام
قاوەی ژیانم شیرین کە...
لەگەڵ تۆدا،تەنیا بژیم
دڵت چی خواست خێرابیکە...
بڕیار بدە هەناسەکەم
ئەم جارەیان مەچۆ بۆ جەنگ...

بۆ ڕۆژت دەبمە خۆر و
لە دەیجوردا بۆت دەبمە مانگ...

دەستەکانت توند دەگوشم
دەبمە عابیدی هەناسەت
کڕنوش بۆ باڵات دەهێنم
گیانی گیانان هەنیەی دڵم
بەس ئەم جارە مەچۆ بۆ جەنگ!
داخی داخانم لەلات نیم
فرمێسکەکانم ،بۆ بسڕی
زوو زوو ژیرم بکەیتەوە
جار جار نازم بکێشیت
بە خەندە ئاشتم کەیتەوە
تەماشایی وەرزی دڵم کە
خەزان ئاسا کە شێواوم
تەماشایی باخی ژینم کە
پایز ئاسا هەڵوەراوم
لە پاشی تۆ دابڕانێك دابڕاوم

عیشق تەریق دەبێتەوە
خۆشەویستی بەدیارمنەوە دەگری...
هەست بە نرکەی دڵم ناکەم
چاوەکانم پەیام دەدەن، بەرگە ناگری...

دیوار گۆرانی بۆدەڵێ
ئاوێنە قسەم بۆ دەکا...
تەنیایی تۆم نیشان دەدا...
ماڵی دڵم هەر تۆی دەوێ
دەستم بۆنی تۆی گرتووە
هەناسە و ئاخ هەڵکێشانم
پەی بەناوی تۆ ،بردوە
گیانی گیانان
خۆزگە ئیستا،لام بویتایە
داخی داخان،جەنگ نەبوایە...

# تەم




هاتۆتە ناو هەناسەمان
لەپەنجەری ماڵ بەماڵی داوە هەوور
گەر ئەمڕۆ چویتە سەر کار
شیکاری شێداری هەوا
یەکەم کاری خۆت و خاوەن کارت نەبوو...
وابزانە تۆ ڕۆبۆتی!

چلۆن زەوی خۆی هەڵخست و
هەوور ماچی هەموو جێگایەکی کرد
تۆ ...
یەکەم وانە مامۆستا بە
بەزمانی هەوور بدوێ
منداڵەکان ئاشنا بکە

پێیان بلێ:-
هەوور هاتووە خۆی دەدوێ
چویتە زانکۆ بە هاوڕێکانت بلێ:-
هەوورتان باش
هەناسەی هەوورتان باش
پێخەفی هەوور و
پۆشاکی هەوور و
نیگای هەوورتان باش
ئەم شەو...
لە پێش نیگایی ئەستێرەکان
لە باوەشی هەوورا نوستین
لە ئامێزی هەوورا هەستاین
هەوور دەستی گرتووین
باوانەی هەور بخوێنین

هەستە بلێ-:
هەوور هاتۆتە گەرومان
لەسەر کورسیەکەی تەنیشتم
لە سەر تەختە ڕەش و
لە سەر پلیکانە و
لە سەر ڕێڕەوی بەشەکان

لە سەر ڕوخساری گەڵاکان
لە سەر ڕەونەقی ئوتومبێلەکان

لە سەر گوڵی ئینجانەکەی دایکم
لە سەر تابلۆکانی ناو زانکۆ
لە سەر قژی کوڕەکان و
لە سەر گوڵم و زوڵفی کچەکان و
لە سەر پەرژینی هەموو باخێك
لە هەموو شوێنێك سبەی نانێ
هەوور بۆ خۆی بە ئیزنی ڕۆژ
لە سەر ڕۆحمان نیشتووە...

گەر مامۆستا
یەکەم وانە باسی سۆز و
بەرتەقایی هەوور نەبوو؟
بەیانی باشی هەور باش و نسرمی
هەستی شەبەنگ نەبوو؟
یەکەم وشەی بەزمانی ئاوڕنگی گوڵ نەدوا
گیانەکەم ...زویر مەبە
تۆش ڕۆبۆتی...مرۆڤێکی ڕۆبۆت ...!

# ئەی خودا



سەرقالم بە سەرقاڵ کردنی خۆم

لە هیچەوە دەچمەوە سەر، هیچ

ماندووم ،بە ماندوبوونی خۆمەوە

دەمەوێ بخەوم و خەوێك ببینم

بە خۆشی یەکانی ژیانەوە

لەم بێداریە ناگەم

لە خەو لە خواردن

لەتی ڤی یەکان بێزارم...

لە هەزاران کۆمێنت و مەسجی بێ کەڵك

هەنوکە، لە ڤایرۆس و ترس

لە هەواڵی بەپەلە بێزارم...
غەرقم لە بێ ئومێدی
وابەستەی ژیانی شار نەبووم
بە مەرامی کۆشکی بەرز ئالودە بووین
چوینە زیندان و ناومان لێناوە شار
دەمەوێ بچمەوە سروشت
ئەشکەوتێك بکەم بە ماڵ ...!
وا بڕیارە سبەی سپێدان
لەم چوار دیوارە
لەم زیندانی ژیانە هەڵبێم
لەگەڵ پاساریەکان هەڵبێم
لەگەڵ کۆترەکان بدەم لەشەقەی باڵ
دەمەوێ ،بۆ تەماشاکردنی گوڵەکان
بۆ جووتە فڕی پەپوولەکان بچنەوە، باخی گشتی

دەمەوێ سیمای عاشقەکان ببینم
چلۆن پیاسەدەکەن و
بە شەرمەوە دەستی یەکتر دەگرن و
بە نێو دارەکاندا پیاسە دەکەن
سەفەرێك بکەم بۆ منارەی مزگەوتێك
بانگی بێ کەسی تێدا نە خوێندرابێ

سنگی ئاسمان شەق بکەم و
لەم بێدەنگی یە فیرار بکەم...!
کاغەزێك لەگیرفانی ڕاستم دایە و
سەرقاڵی (چا) خواردنم ،لە دەروازەی باخی گشتی
زەنگی تەلەفونەکە لێ دەدا و دایکمە :-
(کوڕم ئەگەر چوویتە بازاری نەقیب
مێخەك و خەنەی ئاغا، لەلای هەنگوین فرۆشەکان
بنێشتی کوردیت بیرنەچێ
ئەو کاغەزەی گیرفانیشت بازاڕی سەوزە فرۆشان
بۆ سفرە و خوانی ئێوارەش
شەربەتی سەرگەلۆ لەگەڵ نانی سابونکەران)

سەرقاڵی مەعمەعەی کۆترەکانم
بێزارم لە بێدەنگی شەقامەکان
لە چۆڵی حوجرەکان و
تینوم بەدەنگی گوڵ فرۆشەکان
وەنەوس دەدەم
بۆ نوزەی منداڵێکی کلێنکس فرۆشی ترافیکەکان
ئاتەشگاکان وێنای بەستەڵەك
قفلێکی ئەستور!
بە قاپی کاك ئەحمەدی شێخەوە..

داستانێك لە بێدەنگی
شارێ کپ و کۆڵان بێدەنگ
ناچمە (کافێ) قاوەی دەستی کچەکان ناخۆمەوە
بۆ تاڵی ژیان ڕەنگە بگریم!
کە ،گریاشم ،لە تۆزەوە دەبم بەقوڕ
ئیتر وشك نابمەوە!

لەسەهۆڵەکە ڕادەوەستم
شان دەنێم بەستونێکەوە
ڕوو لە خۆرنشین دەکەم
پڕ بە دەنگم هاوار ئەکەم

ئەی خودا...
ئەم بێدەنگی یە، لە بەین بە و
خودا خەندەی جارانم بەرەوە
بیری پیاسەیەکی ئێوارانی سالم و
بیری هاوڕێ و دۆست و خزمان دەکەم
بیری شۆستە و شەقام و مەستی شەوانی شار
بیری عەشقی شەهرەزاد و کچانی شار ئەکەم
بیری مۆزیکی سەرشەقامەکان
بیری شانۆ و کۆڕی گەرمی شەوانی شار دەکەم ..ئەی خودا

سالم بە سالمی و باخچەی نالی بە ژوانی عاشقانی
بە فڕەی پۆلـە پاساری بێدەنگی یەکەی لـەبار دەبرد
نەرمەچپەی درەختەکان بە(با)کەی سلـێمانی
هێندە دلڕفێن بوو..
وەکو ئەوەی پەیامێ هاتبێ
نالی لـە سەحرای حیجازەوە
نامەیەکی عاشقانەی ناردبێ
لـەپێش سالم حەبیبە فرمێسکی بۆ ڕژاندبێ..

بە خێرهاتنی،ئەم شارێ
بۆسکی برسی کەلانەی گەرم و خێرو خۆشی،
وەك وشەکان نەرمە ڕازی وەسفی بەهار
مەولـەوی سارێژی دڵ و دەروون
لـە شەقامی مەولـەوی

تەنیام و غەریبی دەچێتە کوچەکانی خەیاڵمەوە
شانشانێی وشەی غەمگینە خەیاڵی بێدارم
تامەزرۆی دەنگی پاقلـە فرۆشێکم و
کچێکی گوڵ فرۆش بێتە پێشم بلـێ:–
کاکە چەپکێ نێرگزی جوان بەرەوە !
ئای خودا لـەخەیاڵی نوقمی سەرابم

وای لەمن و وای لەبۆنی نێرگز
ئای لەشەقامی سالمی بێ مەشخەڵی نەورۆز و
ئاخ لە وەرزی بەهاری بێناز

داخ لەم بێدەنگی یە..خودا
دیوانەکەی ژەنەڕاڵی پایزم
لە کتێبخانەی (جەمال عیرفان) خواستەوە
بەم بەهارە شیعری خەزان و
هەڵوەرینی گەڵاکانم بۆ کۆترەکان دەخوێندە
ئەو وشانەی کە ،نەکرابوون بەگۆرانی و
بۆنی پەنجەو هەناسەی(ژەنەڕاڵی پایز)یان گرتبوو..
وەك (شەباب) گیان لە وڕینەیەکدا دەم ووتەوە

لە سەرای ئازادی، لە وێنەکان ڕامام
لەباخچەکان حەپەساو
دڵخۆشیم چەکەرەی دەکرد!..
بەدەنگی ئێوارانی کەمانچەکەی (حامید ژەنیار)

بە ڕووخساری خەڵکی شار و بە کۆڕی شیعری سەرا
بە دەنگی زاری تاوڵە و شەقەی دۆمینە
بە میسکی چایخانەی (شەعب) و
بەگەرمی بازاڕی عارفانی –بە بغورد و داری عود
بەچێژی ناوساجی میسکی کەباب و بۆنی چایی
سەهۆڵەکە و پیاسەی ئێوارانی...

دەمەویّ بفڕم لەم بێداریە زۆر ماندووم
شارێکی پڕ لە بێدەنگی و شەقامێك
پڕ لە پشیلە ی برسی!
ئامانجم قاپیّ شێلمی سەرعارەبانەی بەردەم سینەماکان
سەرنجم لەسەر خوێدانێکی پڕ نمەکی شارە سلیمانی

لە دەرگای (قەیسەری نەقیب) چوومە ژوور!
لە دەنگی بەرزی بەقاڵەکان بێزار نابم ،کە بێزاریان دەکردم
لە خەندەی منداڵێکی عەلاگە فرۆش دەگەم
شرۆڤەی خەونەکانی، بۆ دەکەم
هەزاران جار دەستە بچوکە چڵکنەکانیان ماچ دەکەم
هەر بۆ ئەوەی بەبێدەنگی ڕانەهاتوون...

لەگەڵ ئەوانە دەدوێم
دەرۆزە دەکەن ، ژیانیان دەکەم بە دیرۆك
دەستی کرێکارەکان دەگوشم!
چلۆن شار
بە ڕەنج و عارەقەی ئەوان جوانی پێ دراره
لە شەقامی گۆران ڕا دەمێنم
بەقوڵی دەڕوانمە جاویدانی کچانی شار
چاو چاوێن و بزەی پڕ،لە ناز یان گرانفرۆش دەکرد
بەوەش ناوەستم دەڕوانمە
دەست پەنجە و پوزی ئەو ژنانەی
گەنجی شاریان سەرمەست دەکرد...!

دەچمە بارێك پەیمان دەدەم
وابڕیار بێ، نەچمە ژوانی بەرسیلە
ئیتر شەراب ناخۆمەوە...!
بەتەنیشت قوتابخانەیەکی کچاندا تێپەڕ دەبم
لە سەر دەرگاکەی ئەنوسم
هەمووتانم خۆش دەوێ...

هەینی دەچم، بۆ گۆڕستان
نەزری سەیوان، بۆلای دیداری ئازیزان
لە کێلێك نوسراوە خامۆشی
لە دار ئەرخەوانێك هەڵوەرین
لە شەقامەکان بێدەنگی...

باخچەکانی منداڵان سروود ناچڕن
قوتابخانەکان خامۆش
درەختەکان، بە جۆش
وانەی ژینگە لە پرۆگرامدا دوو هێندە
پەیامی گوڵە بەیبون!
بازەگە لێخن، دەروازەی شار
بێدەنگی شار کۆرۆنا
شارێ و کۆڵان تەمی ڤایرۆس
باخچە و یاریگا
ئامبولانس و ئاگر کوژێنەوە
ترومبێلی فریاکەوتن نیقاب پۆش

لەتەنیشت پەیکەیێك هەڵتورتام
جووتێ دەست کێش و کەمامە
ئەویشم نە ناسیەوە...
سیمای شارێك لە بێدەنگی ئەی خودا...

# وشە لەبیر کراوەکانی
## دایکم، یان سکالا



منداڵیم بیٚ ئەندازە وڕکن بوو...
ڕەوشتی گەورەیم گوزارشتی نەبوو، بۆ جەنگ
گەرووی حەزەکانم پڕبوو ،لە وشەی نەبیستراو
کە، زارم بە پیتی خۆشەویستی پڕا
پەڵپم ،لە پرسگەی شالیاری عشق دا، وەلانرا
ئەو کاتەی سەگێکی بازووم هەبوو
بە ،بەهانەی ژیانی شار ،بیٚ وەفا بووم
عیشقی ئاگردانێکی لێو سور بووم

بەبیانوی سپیکاری و باڵەخانەی مۆدێرنە
دێڕەکانی خۆشەویستی دڵم ڕەش بوو
چونکە وەك خۆڵەمێش دەچینەوە...

دەغەڵیم چەکەرەی کرد
ژیانمان کلۆر بوو
کە ،پشتمان لە کانی کرد
ڕووپامایمان ،بۆ میری کرد
گوێسەبانە ڕووتەڵەکەی نیشتیمانمان ،لە یاد کرد!
ئەو وادەیەیی ئافرێنەر سروشی ،بۆ (ئەشو)زەردەشت نارد
لە بری ئەفسانەی ئاینەکان
زمانی سروشت و دیرۆکی خۆشەویستی فێربوون
شاکاری مەم و زین
بۆ عەشقی دایکم لەسەر زاری باوکم بوو
چیرۆکە پڕ چێژەکان ،لە شەوە درێژەکانی تەمەنی دا
بۆ گوزارشتی توانای باوکم،
ڕۆستەم و زۆراب،لە نێو زاری دایکم بوو
چونکە دایکم حیجاب نەبوو...!

ئەوەی، کە پێی دۆڕاین،ژیان بوو
چونکە،لە ڕێنووسی تەمەندا
فێرکارێکی خراپ بووین
تیانوسی بیرەوەریمان ،پڕکرد لە هیچ ...!

هیچ بەهانەیەکمان نەبوو
جەنگ لێرەبوو، پێش هاتنی ئێمە
ئەوەی بینیمان پریاسکەکەی دایکم بوو
پڕ بوو لە (قەوان)ی ڕەنگاو ڕەنگ
لە میهرەجانی لاواندنەوە، بۆ خاك
خەڵاتی قەڵغانی پێدرا دایکم
لە بەر ئەوەی فرمێسکەکانی دووگیان بوو
لە،شەوی تەنیا و بێدەنگی پڕ نزا
پڕبوو ،لە وێنەی براکەم
لە ئامێزیدا ڕۆحی سپارد
چونکە ،کوڕەگەورەکەی دایکم پێشمەرگە بوو...!

لە هەمبەر ڕووگەی چاو نەترسی تێڕامانی دایکم
کوتومت کاتێ هەڵهات
براکەی لە ڕۆژهەڵات گیانی بەخشی بە قەنارە و
لە ڕۆژئاوای نیشتیماندا

خوشکە شەرەڤانەکەی شەهید کرا...!
سکاڵای نزای دایکم
لە دیرۆکی بێدەنگی دابوو
لە تەنیشت فرمێسکەکانی خۆم هەڵخست
لە بێدەنگی ژن گەیشتم...!

کاتێ ،لە خۆرئاوا بوون ئەیڕوانی
نیگای پڕ بوو ،لەوشەی نەبیستراو؟
نیشتیمان وەك شاڵێکی لەبەر نەکراو
ئازادی بووە ،مۆرانە
هەنگاوەکانی منداڵی
تا ئەو گۆچانەی چاوەڕێی پیری دەکا..جەنگ

ڕۆژی بێ ماتەمی نی یە نیشتمان
چ،درۆیەکی جوان بوو
چما گوڵاڵە سورە پێویستی بەخوێنە
بەهاری کورد هەر خەزانە و ئەم خاکە
لە ئەزەلەوە داری ئازادی تیا ناڕوێ
بۆ دەبێ خوێن بکەین
بە بیانوو بۆ ڕووان
چۆن هەڵخەڵەتاین و داری ئازادی نەڕووا

چەند جوانە درۆ
چەند تەڵخە خۆڵ بۆ بینایی
نیوەی تەمەن ڕۆیشت
یەکەم بینین هەڵوەرین
یەکەم بیستن زرم ،هەر شیرەی فڕۆکە
یەکەم هەنگاو ڕاکردن
یەکەم کوشتن( برا )
یەکەم هاوڕێ خیانەت و
یەکەم عیشق دابڕان
یەکەم لەرەی تەنافی گوێ مردن...!

بە دێژایی بیرەوەری
تولەڕێی تەمەن، هەر جەنگ و جەنگ
یاریەکانی منداڵی ،قەوانی ئەو فیشەکانە بوو
بێدەنگی شەویان لەبار دەبرد
تفەنگە چەقاوەسوەکانی کۆڵان تا سپێدان
وەرە وەڕ و نوزە نوزیان دەگەیشتە بیستنمان
کاتێك، لە کۆڵانەکانی منداڵی چاوەشارکێمان کرد
نیشتمان خۆی حەشارداو نەگەڕایەوە..!
هەتا ئێستاش، بۆی دەگەڕێین ...!

ماڵوێرانی پێناسەیە و داهاتوو ئاوێکی لێڵ
وەکو ئاوێنەی شکاوی تەڵخی دەستی منداڵێك
کە، داهاتووی تێدا بینیبێ
بەو جۆرە قێز، لە مێژوو دەکەمەوە
نامەی بەختم ،بە حونجەش ناخوێنرێتەوە
تیانوسی بیرەوەریمان بۆ ڕاڤە ناکرێ ...!

بیرکردنەوەی داهاتوو
لەم نیشتیمانی هەپرون هەپرونەدا
خاکێکی شێدارە و جگە لە تۆوی خیانەت هیچی تیا ناڕوێ...!

ڕەشبینی ئەو مۆتەکە زەبەلاحەی چاویلکەی بینینە
هەموو ڕۆژێ لە هەواڵێکی( بەپەلە) دا
هەڕاجی کەرامەتم نیشان ئەدرێ
بۆ بێ بەختی،ڕەدوو نان و ماڵوێرانی
لە نیشتیمانی وەلانراودا
مرۆڤ ڕۆبۆتێکی بونیادی لێکچووی هەسارەیە
جەنگ،وەك تەلبەندی دڕکاوی
بە سنوری یاخی بوونەوە ئاڵاوە...

جەنگ کە هات!
لە دەرگا نادات ڕەوشتی پرسیارکردنی نی یە
بە تینوێتی دێت،کانیاوەکان دەخنکێنێ
بۆ نسرمی بەر هەیوانێ دەگەڕێت
دوایی تێپەڕبوون دەیڕووخێنێت...!

دایکم دەیگوت:-
جەنگ ،کە هات
چاوی نی یە، تا پێشێلی گوڵ نەکا و
سۆزی نی یە تا منداڵەکان لە خەو نەکا
ئەوەی نەیزانێ عیشقە ...جەنگ
نامەی ئەڤینداری ناخوێنێتەوە...

جەنگ دوانامەی
ماڵئاوای گیرفانی سەربازەکان ناکاتەوە ...جەنگ
دەنگی تفەنگەکان کپ بکەن
منداڵەکان خەو دەبینن...
فڕەی هەڵوەرینی گەڵاکان فڕۆکەی لیخن
زەمین لەرزە، دەنگی ناپاڵمەکان
لە ،بڵندگۆی مزگەوتێك
زریکەی منداڵ فەتوایەك بۆ خنکانی نیشتیمان
زارۆکێ غەرقی بێدەنگی یە...

دەنگی تفەنگەکان کپ بکەن
منداڵەکان خەو بە ژیانەوە دەبینن
(بابەنوئێل)بە ، بەرچنەیەك دیاریەوە
لەسەر سنوری مردن و ژیان وەستاوە
قەوانی ڕەنگ کراو، هەناسەیەکی تاساو
حەپەساو دەڕوانێ
بوکەشوشەیەکی جێماو
سەدساڵی تر...!
پەرتووکی مێژوو نوسەکان هەڵبەرەوە
لاپەڕەی یەکەم وەستاوە،ژنێك
باڵای وەك چیا و پرچی درێژ.. درێژ
لە سەری بەرزی قەندیلەوە ،تا بەدرە و جەسان
هەزاران حیکایەتی دەربەدەری
سەدان ساڵ ڕۆژەکانی بێ ئومێدی
وەرزەکانی پڕ غوبار و زریان
لێوەکانی پێناسی باری تینوێتی
باسکی بازنی بەردی تۆڵەو

پەنجەکانی گۆگۆ شکانی دوژمن
چاوەکان (ملك الموت) دەترسێنێ
هەستەکانی نەورۆزێ گڕ دەسوتێنێ...
شوێن پێکانی
لە ڕۆژئاوا تا ڕۆژهەڵاتی سەرکەوتن ژیلەمۆ دادەگیرسێنێ...

# شەهیدەکان،لە بێدەنگیدان



سێو سێنان... مژدەی گوڵی بەهاری و
درەوشاوە تر، لەئاسمانی تاریکیدا
وەسێتنامەی ماندوێتی و گۆچانی دەستی شۆڕشگێڕەکان
لانکەی نەبەردی و سمبولی مەردایەتی...
نەغمەی مەلەغەوارەکانی سەرگرمە و شاخی زەردە
گوڵ نەپشکوتووی سەر گۆڕەکانتان هێمایە
بۆنەمری ...بۆ هێمای شەهیدان
چلۆن ،لە نێو نیگای باوەشی خاکی کوردستان ...

بوون  به  ڕۆڵەی نەوەکانی شکۆفەی مرۆڤایەتی و
وێنای قەڵغانی سەرکەشی چیاکانی شاخە ڕەش...
عەودالّ مەبە داری  بەڕووی
چیا سەرکەشەکان  بدوێنە...
شنەی وەشت و تاڤی ئاوی
قەدپاڵ و میسکی نێرگز بدوێنە
لێ بڕوانە لە ئاوێنەی
کەناری هەر دەریایەك
لە سەرسینەی هەرزەرِیایەك
نوخفەی هیلالی مانگ و جریوەی
شوعلەی هەر شەوگارێك
ئەوەنوری شەهیدانی  کوردستانە
لە سەر گڵکۆی مەزاری سێوسێنانە

لە ئەشکی نێرگزێکی دڵ تەڕ
لە بزەیەکی هەڵبزرکا و
لە خەندەیەکی پڕ وەهەمەوە...لێ بڕوانە
ئەو کاتەی گوێزیان لاقە کرد

بۆنی گوڵ و تامی سێو و
شنەی بەهـاریان لـە ناو برد
(٣-٢٢) لەشەقامی شانزلی یە...
بەڤاتیێکی ستار خانی و کۆڵوانەوە بەدی دەکرێ
بە پەڕەموچی لرخە لرخی پەی پێ دەبرێ
لێی ناپرسن لـە کوێوە دێ و بۆ کوێ دەچێ...
منداڵەکان لێی کۆ دەبن
نازان چۆن بیدوێنن
بەچ زمانێ وەڵامی بدەنەوە
جەندرمەکان دەستی دەگرن
لـە ڤاتیکان و دۆمینکان
لـە کلێساو مەعبەدێکا بەپاڵ دەیکەنەدەرەوە

(٣-١٦)ی سێ ی هـەموو ساڵێ
مۆمێکی گریاو
لـە بەندینخانەکانی قامیشلۆ
بە هـێواشی تیشك دەدا
نیگایەکی مەلیك و جبل قاصی
لـە ڕۆژهـەڵاتەوە تا ڕۆژ ئاوا
دەستورو سنوریان شەرمە زار دەکا
مەلێکی کانی ئاشقان

به تەم و غوباری شاخە ڕەشدا
لەم وەرزەدا کۆچ دەکا
لە دەلاقەیەکی خوێناویەوە
لە کۆشکە بەرزەکانەوە
تەماشایی پیلان گێڕان دەکا
تا بزانێ ئەم چیرۆکە
هەوادارانی کێ دەبێ و
کێ باجی دۆڕاندنی دەدا...

بەر لە هاتنی ،گوڵە ڕەنگاڵەیەکانی تەمەن...
بەر لە نوێ بوونەوەی
یادگارییە شیرینەکان وتاڤی زەمەن...
وون بوونی جەنگە ئەبەدییەکانی ئەهریمەن...
هێمنی لە ژوورەکانی عەشق لە سێدارە درا
لەگەڵ چاوەروانی لە تەنییایدا مردن
بۆ نەشئەیەکی وەتەن...
سێوسێنان...
نەوەی وردە بەردی نێو کانیاوەکانی میحەبەت و
گوڵە عەشقیەکان...
ئەی بەرائەترین تەمەنی جوانی
ئەی ڤینۆسی شکۆفەکانی کوردستان...

بنو.. بنو سەبوری لە ئازارەکانت لە دایك بوو
ئێستاش وردە وردە دلۆپە فرمێسکەکانت
لە تەنیایدا دەژین و
سێوەکانی دنیاش لە ئاگرت دەسوتێن...
بەر لە وەرین مشتێ لە ئەجەل و
گەیشتن بە گولّە ناسکەکان خوێن ڕێژکرایت
سێوەکانی دنیاش لەئاگردا دەسوتێن...

ئاخر کێ دەتوانێت ..؟
لە پیرۆزی رۆح و ناخە ئەفسوناویەکان
هەناسەی خۆشی هەلّ بکێشێ...
کێ دەتوانێت
لە نیگەرانی و ئارەزووە ڕاڕاییەکان
قومێ ئاو بنۆشێ...

ئێستاش لەم مەنزلگایە ڕەش پۆشە
دەستورەکان ،لە نزای ئاوێنەییەکی شکاو دەچن
پەیڤە عەشقیاکان ،
لە خوێندنەوەییەکی پڕ مەراق و توڕەیی دەچن...

ئەی جوانتر، لە کانیاوەکانی دنیا و
بێ گەردتر لە خۆشەویستی فریشتەکان...
ئێستاش ،لەگەل ژەنینی شمشالی شوانەکانی سێوسێنان
گوڵەکانت دەکەونە سەما ،بۆ سەربەخۆی کوردستان...
ئەی سێوسێنان ،ئەی لێو ئاڵ
ئەی خونچەی بەردڵانی پڕ ،لە زامی قەراخ ڕووبار
ئەی لانەی شاعیران و شۆرش گێران
وەی دیوەخانی پڕلە میوان...

بەر لە ئاوابوونی خۆر
دەیان گوڵە ریحانەی دلڕفێنی دەستی عاشقان
بە چرکە ساتێکی نزاوە گیرسانەوە و مالئاوایان لێ کردین
بەر لە وادەی ڕۆیشتن
سەفەرەکانتان نزیك کردەوە
لە هەگبەی خەما جێتان هێشتین
ئەم ئازارەتان پێ چەشتین
لەگەڵ سەمفۆنیاکانی تافەی چەم دا
دلە پڕ جۆشەکانت دەکەونە سەفا...
ئەی هێمن تر... لە هێمنی و جوانتر لە جوانی
تەمەن لە کوچە و کۆلانەکانت ژیان بەسەر دەبا...
ئەو مندالەی عیشقی دەپەرست

لە تەنیایدا دەستەکانی کردە دیاری با...
هێمن ...هێمن وەرەوە
ماچێ بکە لەو گوڵاڵە سورەی ...

کە ئارامی بە دڵ دەدا
هێمن هێمن بگری
هەر لێرەوە، تا تێنوێتیت بشکێ و
تا عیشق، لە نێو دۆزەخدا باڵ بگرێ و
تاراوگەی ناوەخت جێ بێڵێ...
هێمن...هێمن بگەرێووە
تا کۆتر و پاساریەکانی(سێوسێنان)
لە شیرین خەو ڕانەچلەکێ...
تا منداڵانی زێدی من ،فریشتە ئاسا
لە بەرائەتا پێ بە پەپولەی بەهەشتێ
هێمن هێمن سەربەنەوە...
ڕزای ماچە تریفەیە کانتان دەکەین
وەرنەوە با لە ڕۆمانێکدا بتانکەم بە حەقیقەت و
ڕووباری چاوانمانی پێ وشك بکەینەوە...
ئاوێزانی چرکە ساتی ڕەبەنیمان بکەن و
لە گەرووی ساردی خنکاومان
قومێك میهرەبانیتان بخۆینەوە...

ئێستاش لە سەر گۆڕە پڕ نورانیەکانتان دادەنیشین...
لە چاوەڕوانی وەفات و
ڕووەکی وشك نەبوو دەپرسین...
کەسێ نی یە ،دەست لە ملانێ بکەین و
قەفەسی ئەوین بە هەناسەییەکی ئەوین بڕین...
بە دڵ و هەناسەییەکی زۆرساردەوە
باوەش بە کێلەکانتان دەکەین
بۆ ئەوەی بە ئاهـێکتانەوە نەمرین
کفنی مسك ئاساتان سینەی پڕ حەسرەتمان دەبڕێت
لە دڵە پڕ مەراقەکانمان ئۆقرە بگرێت..

هێدی هێدی بە دەستە تەزیوەکانتان
فرمێسکەکانی ماچ بسرنەوە...
ئەو فرمێسکانەی جوانترن
لە خوناوی دەم بەیانیان
پرشنگدارترن، لە ئەستێرەکانی ئەبەدی و
خۆشەویسترن لە تەمەنی ئێمە بماندەنەوە
بەر لە ئاوابوونی چەمە زستانیەکان
دابەزینی شادی ،لە فڕگەی بەهار و
بەر لە هەلفڕینی کۆترە نێرگزیەکان
وون بوونی جۆلانەی درەختەکانی ئاسمان
ئەو دڵە خۆشەی جارانمانبدەنەوە...

**هیچمان ناوێ ،چێژی ژیانم بدنەوە**

**هیچمان ناوێ  خۆمان وابەستەی خەمین**

**با بەس بێ دەیان ساڵ ماتەمینی ،با نەبێ شین و گریان**

**نە فرمێسك و نەگوڵ بـــــــاران**

**با پەیامی ئاشتی بڕوا**

**لـە سێوسێنانی شەهـیدەوە بگاتە قوڵای گشت جیهـان...**

# چلەی نیشتمان ...لەدامێنی گوڵاڵەدا



خونچەیەکم نەپشکوتوو دەژاکێم
لە ئەزەلەوە پایز هەیە هەڵدەوەرێم
نیشتمانم بە زاری ناحەزەوە
دیلە دیل ئەوەمنم...
خەونی شەهیدەکان ،ئەوەمنم

چلەی خەزان و گوڵەپاکیزەکانی نیشتمانم
بەدەستی ئەبوجەهلەوە ،
سەمایی هەڵوەرین دەکا ،ئەوەمنم
نیشتمانێکی بێ دڵ و دەستێکی سور هەڵگەڕاو
بە چۆڕ چۆڕەی فوارەکانی دەسەلاتەوە

لەنێو هەنیسکی هەژارەکان و
بەخەندەی سیاسیە هەرزەکانەوە ئەوەمنم
ئەوەمنم..
ئەشکی ڕژاوی ئای ،ئایەکی گەرمیان و
دەنگی باهۆزی ئاوازی سازێکی فرۆشرا و
لە تاقیگەی بەربەریەکان و تیغی شمشێری بیابان
چلۆن ڕۆح دەدەن لە یەخەی نیشتمان ئەوەمنم
تەماشا دڵ لە ئۆکسترایی جەنگدا،
ئاوازی مەرگ دەچڕێ
تەماشا،لە ویقاری تەنیایم
داری ئازادی خەم ئەگرێ
ناڵەی بەرد و هاواری گەرمەسێر
گەردەلولی ئەو سەحرایە
چلۆن بۆسۆی جەنگ ئاوێزانی قورگی کانی بووە
وەنەوزی نغرۆ بوونەو ئەسوتێ ،ئەوەمنم

ئەوەمنم بەخەندەی خیانەت نیشتمانم
ڕەزی عومری هەڵدەوەرێ
تا ئەبەد !
خیانەت بۆ لەخاچ دانی باوەڕ و
خەونی سەری کاسم هەتا فیراق ،ئەوەمنم

ئەوەمنم
بەڕوخساری پیرەمێردێکی فەنا ،
لەخورافەی مەعبەدێکا تك تك ئەڕژێم
ڕووم هەڵنایە لیێ ی بڕوانم!...
ئەمێستاکە ئەوی بێ ماڵ و خاك
تازە عیشقی نیشتمان
نارژێتەوە نیگای شکستی هەمدیسان
ناگەڕێتەوە ،بۆ کۆڵانە ماتەکانی کوردستان

لەدامێنی حەمرینەوە ئەورۆ چلەی نیشتمانە
چلەی فرمێسکی دایك و ناڵەو هاوار و سوتانە
ئەورۆ چلەی هەژارێکی خاك پەرست و
قامکی نیشتمانی گریاوە
ئا ...ئەوەمنم چەندین ساڵە خەون دەبینم
قەڵغان و تەلبەندی سنورەکان، بە گوڵ دەبینم
خیانەت ،لە ڕەقیبی نیشتمان و
ئەشکی ڕژاوی سەربازەکانە دەبینم. ئەوەمنم

سەربازە ئازاکان چوون، بۆ جەنگ نەگەڕانەوە
ئەوانەی، کە هەڵدێن، دەبنەخاوەنی داستان
ماڵی هەژارەکان

دەبێتە مۆزەخانەی تابلۆ بە وێنەی شەهیدەکان
هەژارەکان لەسەر سنور
لاشەیان دەبەخشن بەنیشتمان
گۆڕیان بەپارە بۆ دەکڕن لەشارەکان
بۆ سەرکردەش بلّند گۆکان
سەربازەکان لە ئامێزی گولاڵەو بەدروجستان
لەبری نان خاك دەخۆن
بۆ لێوی وشکی قلّیشاو...
هەوای ئاسمانی کوردستان
لە شارەکان مێرگرد ،دەکەن
چۆن بچنەوە، نێو باوەشی دوژمنان

جەنگ بەر پابوو
بەرگری بۆ هەژارەکان، لە سەرسنوردەبنە قەڵغان
سەرکردەکان دوور زۆر دوور،لە ئازاری نیشتمان
جەنگ تەواو بوو
خەلاّت دەکرێن ڤێلاو گەشتی فڕۆکەکان
بۆمندالّی سەرۆکەکان
شەهیدانە بۆ مندالّە بێ باوکەکان ...!

سەربازەکە ...
لە دوا کێش وخەم و دوکەڵی تێنوسی سیگارەکەدا ،نوسیی بووی
شەرمەندەبووم نیشتیمان، لەدوای شکست
فەرماندەیەك کۆتای بەژیان نەهێنا و
زەردەخەنەی شەرمەزاری، ئیفلیجی بیری نەکرد ...!
سەرۆك خۆی نەکوشت و مێژوو ناوی نەبرد ...!

سەربازێکە لەدوا نامەی ماڵئاوایی ،کە نوسیبووی:-
هیندەی داری چیاکانی کوردستان
هێندەی بەرد و خاکی سەر گۆڕی شەهیدان
شەرمەزار بن
کێ وەلامی دایکی شەهید دەداتەوە ؟
بەچ زارێ مێژووی خۆتان دەنوسنەوە ؟

نیشتمانم ئەژنۆی شکا
کاتێ دڵی خاکیان فرۆشت
منی بێکەس...!
تەنیایی و نامۆیم کڕی و کتێبخانەیەکم هەبوو
ئەویشم بۆ سەربەخۆیی فرۆشت...!

لەکەلاوەی نیشتماندا
لەپێش چاوی حەپسەخان و
پیرە مێردو نالی و شاملۆی ئێراندا
سیاسیەکان نیشتمانیان هەڕاجکرد!
لەسەر سنوور دوو سیٚ چەکدار
پۆستالێکی ڕەقەم شانزەی ئێرانیان
کردبووە پێی کۆپلە شعریٚ
بیٚ نازیانکرد وشەکانی تاسوی بەنیٚ
لەپاشی جەنگ بازاڕمان پڕ کرد لە درۆ
لە بیٚ تۆییدا
هەموو شتێك هەیە جگە لە عەشق
هێشوە خەندە بە لێوتەوە
نمایشی دڵ نی یە , ئەوەی هەیە خەمە ..خەم

ژیان پڕە لەشەڕ...
پڕە لە مرۆڤی بەد فەڕ
پڕ لە قاچاخچی چەك
ئاخر چلۆن مەلەکان سەفەر ناکەن ؟
لە بری تاڤگە و گوڵ و کانی
هەردەم بۆنی باروت دەکەن
هەموو بەزمانی چەك دەدوێین
ئیتر واتایەك هەیە بۆ ژیان ..!؟؟

بڕیارمدا سەفەر نەکەم
گفتم داوە ئەمسالْ ,کە بەهار هاتەوە
باخچەکەمان پڕ کەم لەگوڵ،دامێنی بەڕێحانە
گەر چی دەڵێن:شەڕێکی گەورەمان لەپێشە
بەبیستنی ئەم هەواڵە
داری گێلاس گەڵاکانی کردە باران
ئاخر هەموو ڕۆژێکمان جەنگ بێ ,
نیگایەك هەیە بۆ ژیان ..؟

دۆستە نا دۆستەکەم
تەماشاکە دەم هەیە, بەپارە داخراوە!
تەماشاکە لێو هەیە , دا دوراوە!
ڕوخسار هەیە ، دەمامکی بۆ کراوە!

داهاتووم بۆنی مەرگی لێدێت
بۆ سۆی شەڕ کاسی کردووم
هەر چی بکەم قاچەکانم نایەت نیشتمان جێبهلێ
ئاخ ...بۆ دوو باڵ بەرەو فڕین
بۆ دنیای جوانی پڕ لە ئەوین

زۆر دەترسم لەو پێنوسەی نەخشەی بیرم دادەڕژێ
لە نێو هەموو دێڕێکدا
هەست بە زەلیلی نیشتمان دەکەم
بۆ داهاتوو بۆ تەمەنێك
تاڵەکانی پرچم ،بەلاوی نغرۆ بوون
لە بەهارەوە تێکەڵ بەزستان  بوون
لە ناو دێڕەکانی جەنگدا
بۆنی کوشتنی مرۆڤ دەکەم

وەرە لای گڵکۆی خەیاڵم
من ،بۆنی باروت دەکەم
بۆنی بۆسۆی دارەکانی باخی گشتی
بۆنی سنەوبەری پرچ  ئالاَوی گۆیژە دەکەم
کە،بای ئەنجەل دەیژاکێنێ
وەرە لای سەری کاسم  دانیشە
بۆنی خیانەت دەکەم

بۆنی سوتانی پیاسەیەکی ئێوارانی لای سالم و
ژوانگەی  هەڵبەستێکی شارێی گۆران دەکەم
بۆ خواردنەوەی چایەکی خەڵوز
سەری هەزاران شەوچەرە دەشکێنم
بەدوای ژیاندا ڕادەکەم...!

هەموو شەوێ تەماشای نیشتمان دەکەم
لە قومارچی دەچێ
ئەو دەدۆڕێ
گیرفانی ئێمە ژان دەگرێ

لە ناو ڕۆحمدا ئارام بگرە...!
من بۆنی خەزانی دڵی کچان دەکەم
کە، کوڕەکان سەفەردەکەن
بۆنی بەیانیانی شاردەکەم
پاساری هیچ ئاوازی بۆ ناچڕێ
نیگای نێرگزی دڵ تەڕ دەکەم
نارنجۆك بۆنی پێ دەبەخشێ
زرێپۆش پەلکەکانی وشك دەکاتەوە
من بۆ چارەنووس ڕادەکەم
وەرە لای تەرمم تەماشا کە...

تۆ ،کە هاتی دەبوو هەر نەهاتبای
سەر سامترین هەنگاوی نیشتمانم بۆ دەناردی
گەورە بوونی خۆم و هەڕاجی کەرامەتم
بە مەسجێکی لاتینیدا بۆم دەناردی
لە پۆستێکی خاوەن سەدان کۆمێنتی بێ سەرنج
لە دەقێکی نەبیستراودا
بەپەلە پۆستدا بۆم دەناردی

بە لایڤێکی کات کوشتەی بێ پیلان
لەگەڵ سلاوێکی نیگای پڕ درۆدا
بە خەندەیەکی ئەکشنەوە بۆم دەناردی

تۆ دەبوو نەهاتبای
ئەی دۆستە نا دۆستەکەم
نیوەی ڕاستی تەمەنم ڕۆیشت بۆ ئەلف و بێ
ئێستا بە لاتینی دەنوسم
دەزانم لێم تێناگەی...!

بۆ ئینجانەی ماچ دەگەڕێین
بۆ چێژی حەزی رۆحمان
تازە وشە هەڵدەخەین
ڕستەی زل زل ڕادەخەین

دۆستە نا دۆستەکەم
ئەو چارۆکەی پڕ سیناریۆی کوشتنە دەبەی  بۆ کویٚ..؟
لـەم گەمە یە تیٚناگەم
ئەبیٚ بیٚ باك بچن بۆ کویٚ ..؟

زەوی و ئاسمان ڕاویان دەنیٚ
لـەم شەقامە تیٚناگەم
دیوار ڕاکشاوە،  بەردە بازە
دەرگا بۆتە ڕاخەر ونیشتمان بۆتە جەنازە

لـەم پەنجەرە یە تیٚناگەم
جاران شنەی عەشقی دەدا
دالّدەی پاساریەکانی دەکرد
سەمای بە پەردە دەکرد
بۆ ژوانی دلّدارانی بە مەکرەوە هیٚمای دەکرد
بۆ لـەم پەنجەرانە تیٚناگەم...؟؟

لـە زارۆلـیٚ تیٚناگەم
نازانیٚ جیٚگای خەوی لـە کوێیە ...؟
دووەم خوانی سەر سفرەکەی
لـەکام جیٚگاو سەرەڕێیە ؟
بوکە شووشەی لـیٚ جیٚماوە

لێی ناپرسیٚ گەڕی دەکا ؟
وا ئەزانیٚ چاوشارکێیە
لە بۆنی گوڵ و دەنگی مەل تێناگەم تکا دەکەن...تکا
ئاسمان مانی گریانی گرتووە
یان (با) ڕێگەی خۆی بزر کردووە
یان(خۆر) سەری لیٚ شێواوە
بەس نییە خوا...!

لەم گەمە یە تێناگەم
لەم خاکەدا هەزاران جار قەڵا ڕوخێنرا
کش مەلیك بە ویژدانمان کرا...
لەم بەرنامە تێناگەم
بۆ ئەکشنی هەزار فیلم کۆشك لە شاردا نەما
تەختەی شانۆ هەزاران جار ڕوخێنرا
بەشی یەك ملیۆن ڕاڤە پرۆڤەی مەرگمان پێکرا
دۆستە نا دۆستەکەم
من ئیتر ،هیچ تێناگەم...

جەنگ، کە هات بۆ ئەم شارە
دەنگی پاساری نامێنێ
هەموو ڕۆژێ سەدان تف لە ڕوخسارم دەکەم...!
تۆ پێم بلێ...؟؟
لە بورکانی توڕەییدا
نەفرەت لە دروست بونت ناکەی..؟
ئاخ...مرۆڤی پەیکەرئاسا لە جەنگ
لە عەقلی دەبەنگ
نەفرەت .. لەو مافە ،کە بێدەنگە لەم سوتانە
لە گریان و لەم تاوانە
نە فرەت لە هەموو ڤیستیڤاڵەکانی ئاشتی
لە کاتی جەنگدایە، خەڵاتی خۆی پێشکەش دەکا
نەفرەت لە کتێبی گینس
ئەم هەموو تاوانە ناخاتە پەڕەی یەکەمی
نەفرەت لە شادی
ئەو هەموو ئازارە ناکاتە سەر لوتکەی خەمی...

# شیعرێک لەسەردێڕی هەواڵێکدا
## کاژێر (٩)



بلێن:- بە (لەتیف هەڵمەت)
پرچی ئەوکچە ناکرێ بەرەشماڵ
خیانەت ڕێسەکە دەکاتەوە ،بە خوری...!

نە لە گەرمیانە ،نە لە(با)ی وەشتی کوێستان
سەرچۆپی دەستی (قەع قاع)ە ،لە عوربستان
بە بۆن و لمی سەحرا ئارایشتی بۆکراوە
بۆ سبەینان ئەنفالچیەکان
ڕەدووی دەنێین ،بۆ کوردستان

مەسجێکی ناتەواو
لەئێوارەیەکی لەبارچوودا
بە نێتێکی هەزاران جار هاککراو
بینێرن ...ئا بینێرن بۆ (نالی)لەوسەحرای حیجازە
تیای بنوسن:-
سەدان هەزار حەبیبەی کورد
بۆ (لوقاح)ی عەرەب نەبوو
خەونەکانیان لە هۆش خۆ چوو
کێ شەو دەچێتە گۆڕستان ..؟
کێ گوێیی ،لە نرکەنرکی مردووەکانە ..؟
کێ زاری تەنیایی دەچڕێ..؟
هەستێ و بڕوا بۆ (حامیە)
لە گڵکۆی (٩)ی حوزەیران
لە دامێنی نسرمی گۆڕی (شێرکۆ)
دابنیشێ و (ئەڵاوەیسی)یەکمان بۆ چڕێ
بڵێ:-(خەو نەبوون هەرگیز خەو نەبوون
ئەی بە چاوی خۆت نەتبینی
گوڵەکان چۆن لە ترساندا ڕایان دەکرد
بنچکەکان هەڵئەهاتن
ئەی بە چاوی خۆت نەتبینی

کەروێشك خۆی ئەکرد بە پەیکەر
هەتاو خۆی ئەکرد بە سێبەر
ئەی بە گوێی خۆت گوێت لێ نەبوو
لەو ئێوارە بەسامەدا
سەگەکەمان کەوتە قسەو
بەڵام مەرد بووەوتی چی دەکەن با بیکەن
بەڵام، من نابم بە بەعسی)—شێرکۆبێکەس...

کاتژمێرەکە وەستا
چرکەیەك گەردوون نەوەستا
کاتژمێرەکە لە (نۆ)وەستا
خاك فرۆشیێ دڵی نەوەستا
کاتژمێرەکە خنکا...!
مستەشاریێ نەدرا سزا...!
هەواڵێکی زۆر بەپەلە
مووچەهات، مووچە نەهات
هەواڵێك بە ئێکس پرێس نێردراوە
حوکمەت تەشکیل بوو
ئەم کۆبونەوەش فت...!

هەواڵێ گەرمتر لەهەواڵ

پارێزگار هەڵبژێردا، پارێزگار هەڵنەبژێردرا...!

هەواڵێکی گەرماوگەرم

بەمەرجی کیلۆمەتر سفر

لە ڕێخراوی مافی نا مرۆڤانەوە

(UN)و دەزگای سیخوڕیەکانەوە

لە یەکێ لە بیرە نەوتەکاندا

کاتژمێرێ دۆزراوەیە...!

کام بەرپرس خۆی بەخاوەنی دەکا

کام قاچاخچی لێی وون بووە

لەکاتی واژووی گرێبەستێکدا

لێی کەوتووە و بۆ بەدەست هێنانەوەی

نیشتیمان هەڕاج دەکا

بەم مەرجانە دەیدەینەوە

نۆ چرکە خەجاڵەت بێ

نۆ خولەك ئیفلیج بێ

نۆ کاتژمێر جەرگ سوتاوبێ

نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ پشت شکاو بێ

نۆ ساڵ دەردەداربێ

نۆ سەدە داوەشاو بێ

ئاوا ئاگاداری حاڵی ماڵی دەبێ

خبر عاجل ،بلەزە، هەنوکە :-
کانی یەکانی (زینانە)
لـە ستونی ئەم تەموزە بوون بە نەوت
لـەزستاندا
بۆ ڕووناکی گوندێکی ئەنفال کراو
لـە بەهاردا
بۆ چرایەکی گۆڕستانی وەلانراو

لـە عەرعەردا
بۆ (گۆڕستانی چراکان)
بۆ قاپە نەوتێ دەچێ بۆ سوالّ
ئاخ نەوت پێمان دەکەی سوالّ
ئاخ نیشتمان ،چۆن ناشرینمانکرد سوالّ

لـە داهاتی (٢٩)سالّ نەهامەتی
لـە ڕەنجی بەفیڕۆچووی (٢٩)سالّ
بە بیستنی ئەم هەوالّە
تەرمی بوکە شوشەیەکی جێماو
یەك کیس خوێن و کۆمەلّێ چەکی گیراو
کۆلارەیەکی دەست مندالّی ئەنفالکراو
کاتژمێری لـە نۆ وەستاون

لە نوگرە سەلمان گیراون
بەسەگی ڕەش ترساون
خاوەن شکۆ بڕیاریدا
بەبیستنی ئەم هەواڵە
(٢٠٠)هەزار
ڕم بەدەستی چاونەترس کۆ کەنەوە
بچن بۆ نشتمان بیانهێننەوە

بەڵێ گەورەم ئامادەیە
٢٠٠هەزار دەرچووی دانەمەزراو
٢٠٠هەزار ڕۆحی لە ئیجە خنکاو
٢٠٠هەزار گەنجی بێ ئاڵاو نیشتمان
٢٠٠هەزار لاوی ئیفلاسی کافی یەکان
٢٠٠هەزار  نیشان شکێنی پۆبجی
٢٠٠هەزار لاوی برسی!!!

ئەڵێن درزێ
بە بەرتەقای دارکاژێکی مامەیارە
کەوتۆتە ئاوێنەی ڕوخسارمان
کانیاوێ نەوبەهارێ
وەکو قەڵبەزەی ئاوی ئەحمەدئاوا

فرمێسك دەڕێژێ ،بۆ بێ کەسیمان
تاڤەی ڕووبار وچۆمی سیروانە
هەڵدێ لەدادی کوردی بێ خەم و بێ ئۆقرەیمان ...!!!

نەخوێنەوار ،بێ متمانە و ئیهمال
جیلێکی گەمژە (موعتادی پۆبجی)
لەم کۆڵانە بەر تەنگەی ئێمە
منداڵێك هەبوو ڕێك موالیدی براکوژی
لەخۆشەویستی نشتمان ،ناویان لێنابوو ئاشتی
لەقۆناغی چواری زانکۆ بەشی سیاسی
بۆخۆی ئەمساڵ سەقەتیان کرد !!!

لە کۆنگرەی ئۆنلاینداا
دەرپێی ڕۆشنبیرییان داکەندبوو خەریکی بوون
دوو سێ سیاسی نەفام
لە پێش چاوی حەپسەخان و حاموڕابی
لەژێر بزاڤی فێڵا سەقەتیان کرد
ناویان لێنا بڕوانامە، وەزارەتی پینەو پەڕۆ...!

ئەوە بۆنی نەوتە یان هەڕاجی نیشتیمان
تەریق دەبمەوە، لە بری ڕوو قایمەکان
بڕوانامەی پزیشکی بە تەنافی مەندوبی دا و
نەخوێنەوار لە پەرلەمان!
ئەم برینە سارێژ نابێ
لە سەر مێزی قومار دۆڕاوو
کەسێ نی یە بلّێ:-
گولّم قومار نازانی بگەڕێوە
هەموو مردوین واین بەپێوە!

ئێمە باری کام قاچاخچین
ڕۆژ دەمان فرۆشن ،بۆ شەوێ دەمان کڕنەوە
لە سنوری کام جوگرافیاین
بە حەشیشە و حەز بازی ،دەمان گۆڕنەوە
هەندێ جاریش تاعەتی ئەو قاچانەمان پێ دەکەن
شەق بە شەقی ووت خۆت لادە
(حوشتر بارەکەت چل مەنە)!!!

بۆ خۆم بگریم،یان بۆ تۆ نیشتیمان
وەك ئەو عەشقەی لە دڵمابوو سپێدەی ساڵحان
هەڵیان گرتوو بردیان
بۆخۆم بگریم یان بۆ ئەو لاوەی
لە نەبونی نمرەی پێویست خۆی خنكان
یان بۆ ئەوهاوڕێ خوێندكارە دڵ تەنگەم
لە كۆتای ساڵ خۆی سوتان
یان بۆ بژێوی ئەو مامۆستایی بەشەق بردیان ...!

## کاتێ زەوی تۆڕە ئەبێ




تا ئەبەد دەستی ڕاستم بۆ بینایی و
دەستی چەپم بۆ قاچەکانم ئەگەڕێ
لە نسرمی دەشتی هەپرون هەپرونی ئەم خاکەدا
لە قاقڕە دارستانی ئاوەژوی تەمەندا
کاتێ گەردەلولی ڕقی تۆڵە
لە دامێنی نیشتیمانەوە هەڵدەکا
ڕەنگە نەتوانم...
دەواری هیچ شیعرێکی نەبیسڕاوم
لەم بێزارییە بپارێزم
ڕەنگە ڕەونەقی وشەی لە گۆ بخا
کاتێ شومی ڕقی منداڵێکی بێ باوکی
سەر کورسیەکی وەلانراو

لە مەوسومی وشکەساڵی نیشتیمانی بێ مەیتەرم هەڵئەکا
ئیتر ناتوانم...وەك نوسەرێکی لاقە کراو
وەك پێنوسی سیاسیەکی دۆڕاو
وەك سەر دێڕی ڕۆژنامەیەکی فرۆشراو
بارگراوندێك لە گوڵ بنەخشێنم و
ناوی بنێم نیشتیمانی دیل کراو
یان وەك نیگای بێ شەرمی ڕاگەیاند کاری ترساو
من هەرچیم خواست بێتە خەم و
بە ئا ماژەی پەنجەکانی چاوم پڕ بکا لە ئاو

ڕەنگە نەتوانم بەم نابیستی یە خۆم ڕابهێنم
چاوداخەم و هیچ وشەیەك نەدرکێنم
کاتێ ئاسمان توڕە ئەبێ
چین لە سەر چین هەوری ڕەشی خیانەت و
درۆی گەشی سەفارەت و
پێکەنینی دووڕوی سۆکلانی بەیعەت و
ڕقی تورەی گشت دلۆپێ لەو ئاوەی کە ڕژاندیان
لە مێژووداو منداڵەکان بۆسبەینان تێدا گەوزان!!!

پەردەپۆشی گرێبەستی ناوبارِ و
ڤێلا و کۆشکە بەرزەکان
پێکەنینی ئەودیوو جامە تاریکەکان
ئەبێت بە تۆڵەو بەبورکان
لەم نیشتیمانە سرکەدا
دەبارێت و ئەبارێت، ئەبێت بە باران...

چ،دیرۆکێ ترسێنەر و بێ سەروایە بۆ نیشتمان
لە تولە رێی جەنگەوە هاتوون
بە حەپەساوترین شکلّەوە،لە مەلاّسی هەلێکدان
بە شوێن قەوالّەی مەرگەوەن سەرۆکەکان

بەرِوو بکەن بەگولە و دار گوێز بکەن بەتابووت
لوتکە بکەن بەگۆرِستان
مین بخەنە جێی پیشۆك و
نارنجۆك بۆ بالاّی سنەو بەر و
خۆلّەمێش ناوبنێن دارستان
نیشتیمانی کەمئەندامم،هاتن (کەم)ەکەی بەرن
چیا بۆخۆی سەر گەردانە، هاتن شکۆی بەرن
خاك بەرت بووە و هاتوون بەش بەشی کەن
رِەقیب بۆخۆی فیداکاربوو،هاتن خەونی لەبار بەرن
سنور یەخسیری کەمەر بەندی تەلبەندی کەلّك چی بووە

هاتن دڕكیان لەبن پێ ی دا
نەوبەهارێ لەمەراقی جەنگەوە،
سەدەیەك ڕقی ڕوویان لەگۆڕنا
لە( فینیسیا)ی دڵگیر و جوان لە شارێكی فیردەوسیدا
لە ئێوارەی بەفرانباری هەمووساڵێ
بەدرێژایی ئەم شەقامەپڕ خەیاڵە
لەم شارە ڕەنگاو ڕەنگەدا
لەكۆلانی پڕشەختەدا
پیاوێ سپی سپی تێپەڕ ئەبێ
تا دەگاتە سنوری بێدەنگی وەك تەلیسمێك
لەگەڵ تەم و بارینی كڕێوەدا بزر دەبێ
دارحەیزەرانێك وا لە دەستی دێتە قسە:-

دەڵێ:- ئەوە هاوڕێی منەو ناوی(كاكە برا)یە
هەموو وەرزێ بەم شەقامە ساردەدا تێپەڕ دەبێ

بۆ (ڤاسێلا میكا نۆتیكا)دەگەڕێ
تەنها جارێ لێی بپرسێ
تۆ دەزانی لە نیشتمانی دڵی مندا (ترشی گەورە)و(شەهێناوێ)
دار وگوڵ و بەرد و گیانی ،لە خشەی مێرو دەترسێ
زۆر دەترسێ ناڵەبكاو ،مەل و پەپولە برەنجێ
عەیامێك گوڵی نەوبەهاری تێدا نەڕوێ

دەیان ڕەنگ و سەدان شکڵ و
هەزاران ناوی نهێنی پێوەری ژمارەکانن
میوانێکی کوشندەی مێخی دار بناری چیاکانی کوردستانن
لە جێی دوورِ و مەرجان قورِگی کانیان تاساند
سەدان ڕەز وماڵی مەلی پرِ زەرنەقوتەیان سوتاند
(ڤی ئێس)و ( تی ئێس)ی پیِ ودەست دەبات لاشە دەخوات
( ئێم ١٦ )ی قیزەون
(ئێم ١٦ )ی سەر تولەڕیِ
لاق دەبات و ڕۆح دەردەکا
(نۆفۆرِ)ی دۆستی مێژوو
مرۆڤ هەپرون هەپرون دەکات
هەم گیاندارو دارەکانیش بێبەر دەکا
وای لەم لەباربردنی زەمەنی مرۆڤ قرِکردنە،
لەم هات و هاواری کوشتنە...!

ئەوان هاتون بۆبڕین وحەپەسانی گوڵی نێرگز نێردراون
زۆریان دەست بەسەر کراون
زۆریش لە خاکدا نێژراون
تەنها جارێ خەیاڵ بکە کاتێ مەلی بێ باڵت دی
دەشێ چەند جار پەنجەکانی پرچی ڕەشیان داهێناوە
ئەودەستانە فرمێسکیان سڕیوە کە بۆتەنیایی گریاوە
خەیاڵ بکە، کەروێشکێکی بێ لاقت دی
ئینجا حەز ناکەی هەستی و بڕۆی
چونکە،پێ یەکانە سەفەر دەکاو
قاچەکانە بەرێبواری ڕێگا دەکاو
بەرەو ژووان بۆلای مەعشوق بەرێت دەکا
خەیاڵ بکە،کە گیانداری نابینات دی...
دەشێ ڕەنگ لای ئەو چی بێ...؟
حەزت لێیە سروشت ، لەگەڵ خۆر بجەنگێ
لەگەڵ شەوی چاوی ئەودا ،
زەوی هەمیشە دەیجور بێ

لە دورگەیەکی پەناهەندەی ئەو هەندەرانە بڕوانە
کە ئێوارەی دڵی دادێ غەمگین ئەبێ
(ڤاسێلا) ئەبینی تێپەڕدەبێ

لە مەراقی هەوەس بازی سۆزانییەك
لە ویقاڕی تەنیایی دا
عیشق دەبێ بە تۆڵە و دڵ خۆی لەبەرد دەسوێ
لە شەقامی شانزلیییەو لە ڤاتیکان
لە میلانۆ و دۆمینکان وولاتە بالا دەستەکان
لە پاشی جەنگ چی لەم هاوکێشە دەردەچێ...!
بکوژی سروشت و مرۆڤ (ڤالمارا)مان پێ دەبەخشێ
ڤالمارا:- (من ڤالمارام دورگەیەکی هەندەران و
سروشتی دارستانە چڕەکان
هاتنی گەشتیارەکان و شنەی
پرچی زەردی کچەکان وپێستی برۆنزی حۆریەکان
لەلای من بەدی دەکرێ
ئەمە واژ و پێناسەی منە
لە خەزانی بەو بەختی دا ،
هاتن ناویان کۆپی کردم
هەتائێستاش مرۆڤەکان ترسیان، لەناوی منە)
لەم نیشتیمانە هەپرون هەپرونەی مندا

گەلێ زۆرن ئەوانەی لەگڵگۆکان بەدی دەکرێن
زیندووە ،نیوە ی لاشەی نێژراوە
عاشق دەبێ ،دەستی لەکەمەری گوڵ نەداوە
وابڕیارە بچێتە ژوانی عاشق بوون

لە سەر کورسی ژانە دڵە و
بۆئەبەد تەشریفی نەهێناوە
منی بەجێماو ، نیوەی لاشەم خوراوە
ڕۆژ نییە، لەگەڵ یادێکی دەستمدا نەگەمە شەو
شەو نییە بۆگێڕانەوەی پەشیمانی دڵ نەکەمە خەو
پایز نی یە، وەك گەلاکان هەڵنەوەرێم
وەرزی بەفر بۆیەك تاك دەسکێش گەڕیدەم و
کە قاچەکانم دەتەزین ،
بۆیەك تاك پێلاو دەگەڕێم

تەماشا لەم ڕاڤەی مرۆڤ قڕانە
ئەی خودا لەم وەرزی هەڵوەرینە
لەم قەڕنی قڕکرنە،
لەم ئاخ و خەم و برینە
گەر دەتەوێ دۆستەکانی ئەمڕۆ و دوژمنەکانی دوێنێ
ڕووخساریانت بۆ دەرکەوێ

گەر دەتەوێ هاوپەیمانی ئەمریکی و
دۆستی بەلجیکی و
هاونیشتیمانی ڕوسی و

هەڵۆیستی ئیسرائیلی و
لانەی پەنابەرانی ئیتالی و
ئەلمانیت بۆدەر کەوێ

خەمبارمەبە و ڕامەوەستە
لە لوغمێکی ملەکەوە و ترشی گەورە
و دار بە ڕویەکی ناو شاخەکان بپرسن
بچن لەچیاکان و دەشتەکان،
لە چۆم و کانی و زەریاکان ...بپرسن ؟؟
گەر دەتەوێ ... نیگای بێ دەمامکی دۆستەکانت بۆدەربچێ
لە ڕێبواری بێ پێ ،شوانی بێ لاق و
لە کۆلۆانەی بەجێماو
مەلی بێ لانە وگیانداری حەپەساوی،
ئەم نیشتیمانە بپرسن ؟؟
گفت و خەیاڵی دۆستی خۆتان بۆ دەردەچێ...

نۆفۆڕ: جۆرێکە لەمین دروستکراوی ئیسرائیل

- ئێم (١٤)ئێم (١٦) جۆرێکە لەمین دروستکراوی ئەمەریکا
- پی ئێم پی پی ئێم ئێن: جۆرێکە لەمین دروستکراوی ڕوسیا
- ڤی ئێس ،تی ئێس: جۆرێکە لەمین دروستکراوی ئیتالیا
- ڤاسێلامیکانۆتیکا: دروست کەری مینی (ڤالمارا)
- سۆکلان:ڕەوشت نزم..



سلێمانی بۆ ناپرسێ لە شیوی دڵ تەڕت ؟

بۆ ناپرسی لە کانی و سەدان داری بێ بەرت ؟

بزانە هیچیان لە بەهاردا

گەڵای تەمەنیان هەڵوەریووە ؟

یان بزانە چ ئافاتێ

ڕەنگی خەزانی بۆ باڵای دوریووە

بەیانی زوو لە گۆیژەوە

پاساری سەرچلێ چوارینەیەکی بدوێنە

لێبڕوانە چۆن دەگریا
بۆ مەرگی لەناکاو و
بۆ پێنووسی بەجێماو و
بۆ بێ ڕەنگی ئەم خەزانە
قوڕی دەکرد بەسەر خۆیا

دیداری پڕ بوو ،لەجوانی
زار مەست دەبوو،بە بیستنی وشەکانی
مرۆڤ بوو،کۆڕی لاوانی پڕ خۆشی
لە بیرم دێ ،کە دەی فەرموو-:
(ژیان شانۆیە تەنها بژین بەدڵ خۆشی)

تەماشاکە،باخی گشتی
گەڵاکانیان بۆ ڕزیون
نەشئەی گوڵ و جوانیەکەی بۆ ژاکیون
ئەم فرمێسکە سوێرانە هی کام شیون...!
ئەم هەموو نیگا شپرزە و غەمگینانە
لە پشدەرێ ڕانامێنن
بۆ (شەعب) هەواڵ دەنێرن...

هـی کام پەلکی هـێرۆ و چەمی بالیسانن
یان مەلی شپرزە و تافەی بێ ئافاتی مەنگی دەریاچەی دووکانن...
سەرچنار و سەرای شار کۆڕو پەیڤی لاوەکان ،
بۆ بەخێرهـاتن چاوەڕێ یە...
ماوەیەکە دیاری نییە!
دڵی دووزام تادەگاتە سنوری ڕۆم
پرسیارێکیان ناردوە، پشدەری نازانن لەکوێ یە...؟

کەس وەڵامی ناداتەوە !
سەرگرمە پرسەی گێڕاوە
کانی عاشقان بەوزامەوە
لە هـەڵبەستێکدا وەستاوە
هـاوار دەکەن شاری شاران
خەزان گوڵی بەهـاری برد
بڵێسەی نەورۆزی کورد
پەیام بدەن مەرگ هـاتوو
بەجارێ (بەکر)ی کوردی برد

لە بێکەسی شەو ناگەین
لەبێ دەنگی خۆشمان ناگەین
هـەموو لـە کوچەکانی چاوەڕوانی وەستاوین
کە،بە تەنیشتماندا تێپەڕدەبێ
بە سەر پەلی چەند درەختێکەوە
ئێمەو ئەوان گوڵەکانی باخی گشتی
ئێمەو ئەوان گیای کەناری ڕێگاکان
ئێمەو ئەوان بەستە و گۆرانی
ئێمە و ئەوان
دەست بۆ بەڕێکردنی تەرمێك بەرزدەکەینەوە
کێ دەی لاوێنێتەوە

کە،شاعیر دەمرێ
مانگ لەو بەرزیەوە دێتە سەرگۆڕەکەی
ئەستێرە لەدیوانێکی دا ،
ڕا کشاوەو دەبریسکێتەوە
هـەر لەودەمەی لاوێتیدا
(زێڕو گڕ) یاساخ دەبێ و
پێنوسێ لەبڕشتی نەوبەهـاری تەمەنیدا
خاڵی کۆتایی دادەنێ...

وەرگێرەکان دەیکەن بەتاقیگە
سیاسیەکان ،بۆ هــەمیشە پشتی تیٚ دەکەن
مێژوونوسەکان تەنهــا لـەدێڕێکدا دەی نوسنەوە
پەرش و بلاّو دەبیٚتەوە ،
هــەزاران پرسەنامەی بۆ دەچیٚ و باسی دەکەن
کەس خەیاڵەکانی ناچنیٚتەوە...

لـە کۆلاّنی گاڵتەجارِیدا وەستاوین
تەرمی شاعیریٚ دەبەن
کیٚ وەك رِازی ئاوازەکانی خۆی دەیلاوێنێتەوە...
کیٚ گۆرانی بۆ ئەو هــەموو جوانیە دەڵیٚ و
لـەدوای ئەو دەمێنێتەوە...؟

کیٚ سەرنجی رِۆدەچیٚتە بەربەرِۆچکەی
گیایەکی سەرەرِیٚ و (گوڵە نێرگز )دەلاوێنیٚ ...؟
کیٚ دەبیٚتە خاوەن خولیای (چوارینەکانی پشدەری ) و
کیٚ بیٚدەنگی دادەگیرسێنیٚ. ..؟

کێ دەبێتە (تاری تەنیایی ) و
پیرە سەمفۆنیایەکی مۆزارتی بۆ دەچڕێ...؟
ئەوەی هەتا سەر دەپشکوێ تەنیایە
دڵ هەر خۆیەتی و نییەتی هاودەنگێ...!

لەوپەری دلتەنگی دا،هەموومانین
دەتانەوێ هەرخۆتان بن
لەئەوپەڕی ڕاستگۆیدا!!
چیمان کرد ،کەشاعیرێ دەمرێ
کۆڕەکان گەرمتر
پەرۆشی ڤیستیڤالەکان زیاتر
کێ دلی دەلەرزێ و ماتەم دەگێڕێ

لەو ڕۆژەوە ئاسمان دەگری
نیشتیمان لەسەرقالی، قافلەی چەتەکاندا
جگە لە هەڕاجی کەرامەتی پیتەکان
بیێ ئاگا ،نابیست و نابینا
بۆ مەرگی شاعیرێ فرمێسکێ نارێژێ...

هـەربۆ شەوێ
بڕۆ بەتەنیشتیان تێپەڕ بە
کەسیان نەنوستوون ،
چرپە چرپیانە مردووەکان
پێمان دەڵێن :-
چۆن دڵتان هـات ئا بەو زووە
بینێژن و بیشارنەوە
بەرلـەوەی چوارینەکانی بگا
بەرلـەوەی قەصیدەی ئەنفال بگات
بەر لـە وەی سروشت تەیمومی بکات
بەرلـەوەی بلێسـەیەك ،
لـە،کەرکوکەوە گڕی سرودێك بلێتەوە
پێش ئەوەی لـە پشدەرەوە
گۆرانیەکانی شاعیرێك شینی بۆ بگێڕێ
چۆن دڵتان هـات بیشارنەوە...!؟
چۆن دڵتان هـات
بەشەونمی شیعرەکانی
بەخوڕەی کانیاوی قەسیدە و
بەکێش و سەروای لیرك و
بە چەپکێ خەونی سەرابی
ئاپۆڕایی بە ڕێکردنی بۆ بکرێ
چۆن دڵتان هـات...
چ بایەك هـەڵی کردووە و

چ هـەورێك داباریووە!
چ ناسیاوێك بانگێشتی كردووە!
چ هـاوڕێیەك لـەم درەنگی شەوانە
لای خۆی بۆ ئەبەد گلی داوەتەوە
كێ دەڵێت، نەچۆتەوە كۆڵانەكانی منداڵی
لەچایخانەی (شەعب )لای نەداوە
لەقەرەباڵەخی بازاڕ،
شتێك لێی نەداوە!!
شنەبای كۆنە عەشقێك
خۆری ئاوا نەكردووە!
لـە ئێوارەی خۆیدا كێ...دەڵێت

كێ دەڵێیت!
ئیتر بۆ ئەبەد نایەتەوە
وەك چۆن ئەوانەی ڕۆشتن و نەهـاتنەوە
وەك چۆن جارێ تر
لـە خۆرهـەڵاتی ئەم خاكەدا
مرۆڤ بۆ ژیان ناگەڕێتەوە
لـە ئەو سەری ئەوسەری دنیا بگەڕێ
تادەكاتە دەڤەری پشدەر
(بەكر) ناوێ دروست نابێتەوە
ئەودەمەی شاعیرێك دەمرێ...

# سۆزێ بۆ (سۆران)



لە دیدگای یادێ بێ ئاگام
وەکو جاران کەدێمەوە
بۆ نیشتیمانی هەپرون هەپرون کراوم
(سۆران) بینینم سۆراخت دەکا
سوێند بە گۆڕی پڕ نورت
تاسام و نەخنکام
دڵ کەوتە شاڵاوی هەنیسك و نە گریام

ببورن نەمهێشت
ئەم تێکشکانەی ڕۆحم بتبینن
ئاخر پەپولە لەکوێ ...؟
بەرگەی سوتانی دڵ و
هەڵمژینی تەوژمی ئیلهامی هەیە...

ببورن زوو تێپەڕبووم
توانای بینینی ڕەنگاڵە و
تابلۆ سحراویەکانی (سۆران)م نی یە...
ببورن لە هەڵهاتنم
لە زایەڵەی ئێوارەدا
میسلی مۆمێ دەتوێمەوە
بەرگری ئاخی ئاگری ناخی ئێوەم نی یە...
ڕاماوم و بەخۆم دەڵێم-:
چۆن توانای ئەو ڕاموسانەت هەیە!...
ئاخر سۆران دڵم بۆتە ستوی بەر رەشەبا...
ئینجانەی خەیاڵەکانم
جگە لەمەراقی بێدەنگی
هیچ گوڵێکی سەر دەر ناکا...
دڵ لە هیزری بێ تۆی
لە دیدگای یادێکی تۆ

ئەمڕۆ ئەفسوس ،کە داوی دلّم نەپچرا...
بەدیتنی باخچەی پڕ گولّی تەمەنت
نازانم چۆن چاو نەپژا !




لە باشوری ئەم خاکەدا

نزیك خۆرنشینی عومرم

باخچەیەکی پڕ لە گوڵ و

سێ چواردار هەناری لێو بەخەندە

هێندە تامەزرۆی یەك بوون،لە بیریان کرد!

پەلك و لمۆزی دارخورماکان

پەرژینێکیان بۆتەنیوون

ڕۆژێ دادێ باخچە دەکەن بە بیابان
سێبەرونشێودەکەن بە گۆڕستان بۆ گولەکان
ئەم باخچە پڕ لە نازو دلکەشە
سەردەمانێك پاساریەکان
بۆیان نەبوو تیای بخوێنن
تەنیا پەپولەش بدوێنن
نە جۆگا ئاوی دەلاواند
دڕکیش گولی ئەدوان
لە چین وماچینی ئەم خاکەدا
ئەم باخچە بێ خاوەنەی ئێمە فرەخاوەنە
هەر ڕۆژەی باخەوانێك خۆی پێ دەناسێنێ
ڕۆژ لە دەستی یەکێکدایە و بۆ شەو دەیان میوانداری دەکا

کاتیش هەیە تا دڕەنگێ
دەنگی پێکەنینی شوشەی سەرمەست و
نالەی چلی هەناری شکاو ئاوێتە دەبن
هەربۆئەوەی خەمی دەرکا
لە شەوی ڕمبازان و
شەوی سەدان ڕەنگ
لگاو و سێڕسکێن دەکەن
گەمە بە شیری مندال و قومار لەسەر

تەنور بانەکەی پورە (ئایلە) دەکەن
بەم نزیکانە نانە شانەیك
پڕلە کولێرەو گەرمەنان

لەسەر قەڵاوە بەشەق
تاسنوری بێ ناو دەبەن
ئەم فرانك و دۆلارە ڕیش درێژانە
چەند ئاسان دێن
ئەم باخچەیە بێ ئاو دەکەن
بەدەمامکی ئاینەوە
فوو لە پشکۆی خۆڵەمێشی شارێ دەکەن
شارێك باخچەی خاکی دڵم
بەشێك لە تەندووربانەکەی پورە ئایلە...



دادە دۆکەی نەڕژا

ئێمە ڕشتمان

داهاتومان پێی تێ کرد!..

دارا دوو داری دی

ئێمە دوو ئیدارەمان دی

دارەکانی دارا دوور

یەك ئیدارەی ئێمە،دوور تر...!

هەتا ئێستاش....
چاوەڕوانیم گەشەدەکا
بۆ ویقاری مام زۆراب
فێری عیشقی مێوژی کردین
نەك شەراب !!!

ئەوەی گریا و لێمان وون بوو
پێمان نەدۆزرایەوە
بەبەی زەینەب بوو
وەك بوکەشوشەی بەجێماوی
نوگرەسلمان و عرعر...!

فێری واوی (داو) نەبوین
داو چووە خوێنمانەوە،
بۆ قڕکردن...

ئازاد ڕۆی زەردە نەگەڕایەوە
چونکە، دڕ بوو
لەپاش قەڕنێ کە، ئازاد گەڕایەوە
ئەوەی دڕبوو زەردەنەبوو،بەتەنها
ئازادێکی سەوزیش بوو...!

لەبیرم دێ ،کاتێ کەباران دەباری
خەیاڵدانم ژانی ئەکرد
بۆ وانەی (باران دەبارێت)
کاڵفامی بوو ،باران نەبوو
ئەوەی باری خەم بوو دەباری...!

زۆرمان ڕوانی بۆ تەیارەکەی دارا
تەیارەی واشمان زۆر بینی
ئەوەی نەمان بینیبوو ،بینیمان
لەسەر دەستی ئەم تەیارانە...!
ئەوەی دارا دی (دار) بوو
ئێمە سەرابمان دی
لەدامێنی نیشتمان خیانەت...!

فرمێسك بۆ خۆم دەڕێژم
نیوەی تەمەنم ئەلف وبێ بردی
ئیستا بەلاتینی دەنوسم
خۆدەزانم لێم تێ ناگەی...!

(چ) لە(چێل)ەوە فێربووین
ئەنگوستێ خاکمان پێ نەکێڵا

به چەك زارمان پڕا
(باڵدار) لەبیر چووبوو
بۆ ئەبەد كوشتن لەخوێنماندایە...!

هیچ وانەیەك لە(مام بزن)ەوە،فێرنەبوین
ئەوەی ئاوێتەی ناخمان بوو،
عشقی كاریلەكەی نەبوو
شەڕەكەی لە ڕۆحماندا چەكەرەی كرد...!!!

لەڕۆژئاوا تا ڕۆژهەڵات
هەموو شوێنەکان عەفرین بێ
بە ئێمە چی...؟
لە باکور هەتا باشور
ڕێپێوان و خۆپیشان دان لەدوورەوە
بە عەفرین چی ...؟
ئەرێ عەفرین بە ئێمەچی
کە،کەرکوك داگیرکراوە
لە سەرمێزی قومارخانە
سەرکردەکانمان دۆڕاوە

زستانی ڕابردوو بوو،لە پاریس
لەمەزاتی نیشتیماندا
چوار شاری کورد فرۆشرا!

تازە عەفرین بەئێمە چی
بۆ عوسمانی و سوڵتانەکان دانراوە
سلیمانی وکرکوك دڵی کوردستانم
بە هیلالی صەفەوی دراوە

نۆبەمان وەرزی گوڵە،
بۆئەوکاتەی کە بەڵێنی پێدراوە
ئاغا خۆی بۆ مەڵاس داوە
ئەی نازانی شارێ هەبوو
ناونرابوو بەرخۆدان
پڕ لە ڕەقیبی کوردانە
کۆبانێ بوو،جێی شانازی
ئیستاش شارێکی وێرانە

لە (کرملین)هەتا دامێنی (ڤاتیکان)
پەل دەکوتن بۆ نەمانی کوردستان
لە شەقامی (شانزلیە)
تانزیکی ماڵەکەی خوا
وەکو نێچیر لەپێش چاویان
هەر گورگە و شارێ دەخوا

ئەم یارییە زۆر لە مێژە
جەنگی سەرمایە و هێزە
خۆ خۆری یە مایە پوچین
کە سەرکردە خۆی بێ هێزە

دوژمن بۆ گشتمان بەهێزە
خۆش باوەڕی و ڕوو گەشیمان
ئەم جارە خراپ دۆڕاوین
لەمێژوودا بنوسنەوە
جاری دووەم ، بەش کراوین
عەفرین بەمن چی ،جاشەکان
عەفرین بۆخۆی فرۆشراوە
لەڕیزبەندی شارەکاندا ،لەپاش سنور
شاری شێخ محمود نوسراوە...

## کۆجۆ



لەهاوینی ئەو ساڵەوە
گوڵ هەڵوەری
ویژدان سوتا بۆ منداڵەکانی کۆجۆ
پەڕەی مێژوو خوێناوی بوو
جەنگیز خان و تەیموری لەنگ
لەشەرما کەوتنە سەر ئەژنۆ
قژ ئاڵاوی ڕوو گرژاوی
پێست تەنکی بێ ڕەنگ
کۆڵوانە و پرچ زەردی
هەڵهاتووی گەنم ڕەنگ
کاتژمێری هەنگاوەکان

تێپەڕین ،بۆ ئەوساتە وەستاون
مێژوو نوسی
چڵکاو خۆری بەردەستەکان
بۆ نوسینی ئەم تەمبورە
خامەو پەنجە شکاون

بەبێ دەنگی هێواش...هێواش
ڕێبواری ڕێی شەرمەزاری
تولە ڕێی پەشیمانی بگرن...
ژەهری بغداد چاوەڕێ یە
تا زۆر بخۆن زوتر دەمرن...
برا بکەونە ڕێ
پردی چەمی خاکی خۆمان
بەداهاتی نیوە موچە کریەوە
زامی سەختی دووز خورماتوو
بەخەندەی هەرزە سیاسی
بەم هاوینە کولایەوە

وا بڕیاربوو خاك فرۆشان
نەچنە خوانی کڕیارەکان
وەلێ پۆل..پۆل کڕنوش ئەبەن
بۆ حزووری بەربەریەکان

پێکی ژەهری کەفی دیجلە
بۆ ئیفلیجی و شەرمەزاری
ئەم پاییزە دەیخۆنەوە
بۆ گیرفان و نەوت و سامان
نەك هەرجارێ ...سەدان جارە
شان ماچ دەکەن، خاك هەراج دەکەنەوە
وەسێیەت دەکەم بیرتان نەچێ
هەویە ودەفتەری خدمەکان
لەپاش(سی)ساڵ شێری ماڵ و ڕێوی دەرێ
عەر عەریەکان ڕاتان دەگرن لە بازگەکان

پێش برِکێ و پەلە قاژە
لەو ڕێبازە پەلەمەکەن
لە مێژەوە بۆ لغاوی هەمان ئاخورِ
هەرهەمووتان بەرِێ دەکەن.

دەمەیەك
بۆنی گوڵەکانی باخی گشتی لێ دێ
قوتار دەبێ و لێمان هەڵدێ
لە 7ی ئازار(با)هەڵ دەکا
نیگایی خوێنی(کاسکتێی پایز) ە و
ئاسمانی ئەم شارە ، ڕەنگ دەکا
داری ئازادی،سور دەکا...

11ی ئازاری ئەوشارە
کەشەوداهات
ئازادی لە شەقەی باڵ دەدا
لە هیچ شوێنێ
ناو تاقان و هیچ کەنارێ ئارام ناگرێ
لەئاسماندا باڵ بۆ هەورەکان ڕا دەخا
تائەگاتە گۆڕستانێکی بێ دەنگ!
لە ئامێزی (سەردەشت عوسمان)
لە ژوور سەری ،داری ئازادی ئاو دەدا

١٣ی ئازار  نەوبەهاریٚ
کە (با) ی وەشتی ڕاپەڕینیٚ
سەرمایەی زۆرداریٚ شەن ئەکا
بۆنی خوێنی(کاوەگەرمیانی) لیٚ دیٚ
بیری ئازادی  لەق دەکا...
١٤ی ئازار بە چەپکیٚ نێرگزی زەردەوە
لەوێندەریٚ،(ودات) ناویٚ
نابینایەو بەشەقامەکاندا ڕادەکا..
لە والّی بەرپرسێکا صەقەر ئاسا
بە ئەشك نوسیبوی ئازادی
لەجێی پێنوس چاوی دانا!
هەتائیستاش بۆ هەوالّی ئازاد ناویٚ
زومی کامێراکەی کار دەکا...

لە ٢١ی ئازار و بلّێسەی نەورۆزی بەهاریٚ
پەلە هەوریٚ بۆنی نەوتی خاوی لیٚ دیٚ
بە لێزمە ،کەدا دەکا
خەندەیەکی (سۆرانی مامە حەمە)یە و
لە ئاسمانی بابە گوڕگوڕ
ئەو ئاگرە  خامۆش دەکا...



خاکمان نی یە

ڕۆزی نیشتمان لێ ئەدەین

هەژاری قوڕگی گرتووین

نمایشی قارون ئەکەین

بووین بەسینەمانی سەرزەوی

سینەما نیشانی جیهان دەدەین ...!

سێ شارین و هەزار شانە

سەدان کاندیدی چواشانا

دنیامان سەرقاڵکرد و

هیچ ناچێ بە گوێمانا

وازستان دێ
موچەی هاوین نەهاتووە
فەرشی سورمان ڕاخستووە
بووینە گاڵتەچی دنیا
مێژووەکەمان وادەڵێ
بەر باخەڵی
هونەرمەند و مامۆستاکان
وا سەوزەڵە خانم دەڵێ...



ئەوەیە فرە خاوەن

بێ پیلانی و پڕ لە لایەن

یەڵا هەڕاج دامانشکان

هەر بەدەستی خۆمان

نێوچەوانی شارمان شکان

شارێکە پڕە لە جوێن

پڕ لە مێش هەڵمژی خوێن

هەر لەمیری بابانەوە

تائەورۆ و دوێنێ ی دڵ ڕفێن

هەڕاجمانکرد بێ خاوەنە
سەدان بڕیاری لایەنە
کەس ڕێزی کەسی ناگرێ
بۆ پلەوپۆست هەمووی دەمرێ
شارێکی فرە خاوەنە
بێ پارێزگار
بێ ئەنجامە و دوا ڕۆژ وونە
ئەو شارەی شاری شاران بوو
حەزدەکا بێتە قەزا
لەدوایدا بون بەلادێ
بێ پارێزگا
ئەنجومەن و شوراکەشی
هێواش هێواش وا بە لا دێ
منافەسەو باڵ باڵێنە
هەفتەی دوو ڕۆژ دەوام هەیە
بۆ واژۆ یەك
بەبێ ڕیزبوون پاڵ پاڵێنە

هەڕاج دەکەن دوا فرسەتە
دەرمان بکەن لەم میحنەتە

داشكانێكی گەورەیە
بەگەندەڵی بیناسەوە
هەر نرخێك بەی دەی فرۆشین
بەناو ماڵ و ئەساسەوە

نیوە نرخی پیٚ مەدە
چونكە ئیستا بیٚ حوكمەتە
بیٚ خاوەن و فرە دزە
بیٚ پلەو پایەی دەوڵەتە

هەراجمان كرد،نیوە نرخ
بازاڕمان پڕی هەڕاجە
گرانی یە،چی پەیداكە
قازانج نی یە ،هەربۆ باجە

بەرهەمی خۆماڵی نی یە
بیناكانمان بیٚ گەراجە
زانكۆكانمان زانست فنش
بۆكات كوشتەو ووردە ماچە

پڕ کۆبونەوەی بێ بەرهەم
عەرزم کردن
خوریەکەمان لای هەلاجە
یەڵا هەراج (سلێمانی)
با زیاتر سوکی نەکەن
شاری نالی و پیرەمێردە
بەردەم ڕق و شەقی
پلەو پۆستی حیزبی مەدەن
ئای کە ئێستا
بێ خاوەنی ،فرە خاوەن
بەوەکیل و وەکیل کاری
بەر شەقی زەمانەی ئەدەن
هەڕاج هەڕاج ئەڕۆینەوە
چۆن مێژوو وەڵام بەینەوە..

# دیل بە دیل




لە پاش بیست ساڵ

بێ پەنا بێ ناونیشان...

مێژوی تاڵی پاشەڵیان

بەتەنافی ئومێدەوە،هەڵئەخست و

تۆز و خۆڵیان کردە چاومان...

دوایی بیست و نۆ ساڵی چاوزەق!

دزیان لە ڕابردوو کرد

یادەوەری و شاباشکردن

بەوشەی زل ئەنوسنەوە

بە هەڕەشەی ماڵەباجێنە
پاداشتی گەل ئەدەنەوە
نە جەنگی ڤێتنامە دیلم
نە شۆڕشی فەرەنسایە
دیل بەدیلی ئەمجارە یان
شەڕی کۆنە قینی تیایە

بڕوانامە و زانست گوزەشت
یاسا،وا لە لولەی چەکدایە
سەدان پەیمانگاو زانکۆ
لەسێبەری حوکمی درۆ
ڕەنجیان واچووە بەزایە

لەدوایی شەڕی برا کوژی
چیان بەم گەلە نەکرد
لە ساڵی نوێ بەمژدەوە
دادگاکانیان، لەکەدارکرد

بوونی دادگا، چ کاریگەر
دیل بە دیلیان ،لە دەشتا کرد
دادوەران ،بۆ نابیستن
ئێوە لە کوێن... ؟؟
لەکام سوچی ،ئەم سولّحەدان ...؟
وەرنە دەرێ عیعلان بکەن
لە کەمیندان بۆ هەنگاوی هەژارەکان

پەنجا بەپەنجایی جارانە
بە پەرلەمان ،هەلّبژاردنی درۆ
یەك گرتن و یەك مالّی کورد
بونی دەستەلّاتی سەرەڕۆ
دوای ڕێکەوتنی نەوەد و نۆ...

تەنها نەوت ڕێکی خستوون
لە براکوژی پەکی خستون
جار جار شەڕی بیر بیرێنە
ئێستا بەزمی دیل دیلێنە

خیانەت قورگی گرتووین
سنور هاتۆتە نەوەو شەش
لە داعش هەڵمان تڕان
ئینجا وەرەبین بەدووبەش...

# سەربەخۆیی

لە ئێستاوە دەنگ بڵند کەن

سنوورەکان گوڵباران کەن

هەرچی لوتکە و گەرمەسێرە

بۆ بڵێسەی جەژنی نەورۆز تاوی بدەن

لەم کاتەوە تێدەکۆشین

خەو لەچاومان دەتۆرێنین

هەرا بەئەشکی دایکی شەهید

ئەم ئازارە بڕەوێنین

شاسوارێکی دڵی کوردان

بۆ مەحشەری ژیان دێنین
بۆداهاتوو بۆ کوردستان ،
سەربەخۆی بەدی دێنین
لە ئیستادا ئەم ئازارەی لەکۆڵمانە
خەباتەو هەر لەمێژەوە
بۆسەر بەخۆیی کوردانە
سەرهەڵبڕن ئالآی کوردە پێشەوایە ،لە پێشمانە

شۆڕشەکەی شێخ سەعیدە
ڕێبازەکەی (شێخی نەمر) ڕابەرو و ، شانازیمانە
ئەمە ئەرکی سەرشانمانە
سەربەخۆیی مافی کوردە
بۆ ئازادی کوردستانە
ئەم هەنگاوە
پڕ ئازارو دەر بەدەری و ئێش و ژانە
پێشمەرگەین و
شوێن هەنگاوی شەهیدەکان، ڕێبازمانە
بەرپرسیارین لە مێژوومان
لەو ئامانەتەی لامانە
سەربەخۆیی بەری ڕەنجی
شۆڕشی مەزنی کوردستانە

لە یادتان بێ و بیرتان نەچێ
بەهاری پڕ لە نێرگزی نیشتمان
هاتن کانیان ئەنفال کرد
شاخ و چەم و گوڵی جوانیان
چاو و پەنجەو ئەگریجەیان ،تیر باران کرد
ئەنفالکراین بە مقەستێکی ژەنگاوی
نەخشەی کوردستانیان بڕی
فەتوایان دا ئەم تاوانەمان لێ بکرێ

سەگەکانی لای تۆبزاوا و سەحرا و لمی بەری عەرعەر
لەقامکی دووژمناندایە و
مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی لەمەوبەر
ئەمە ئەرکە و لەپێشمانە ،لەسەر شانی هەموومانە
پەیامەکەی قاسملۆیە
ڕێبازی بەرخۆدانە
لەیلا قاسم هاواری کرد، کورد خاوەنی کوردستانە
هەردوێنێ بوو شەنگالیان برد
هەزاران گوڵیان هەڵوەراند
لە سێبەری فەتواکاندا
سەدان پەپولە یان سووتاند

کوردە هاوار،عەرەب نابێتە برا و
فیدڕاڵی هەر وشەی زارە
هەرچوار پارچەی کوردستانم
سەدان ساڵە بریندارە
بۆژیان بێت یاخود نەمان
سەر بەخۆیی ئامانجمانە...

# نامەی شەشەم



**وەرزی بیرکردن، پایزە پایز ،شەهرەزاد گیان**

لەگەڵ هەڵوەرینی گەڵایی درەختەکاندا ،بەتەنیشت خەزانی ئەو گوڵانەی نەگەیشتنە لای تۆ و هەڵوەرین ،لەم ئێوارەی تەنیاییەمدا،بەدەم چنینی ئەم وشانەوە هێواش هێواش هەڵدەوەرێم بۆ یادێکی ئەومرۆڤەی لەیەکەم پیتی ناوی تاکۆتایی لەناودڵمدا چێکردوە،

یاقوت ئاسا لە دەریای دڵم دا ڕەونەق دەداو منیش ناگەمە چێژێکی خەم رەوێنی وەك گوڵی ئینجانەیەکی وەلانراو تنۆك تنۆك بە هیوای دڵۆپێ لە بارانی خۆشەویستی ئەودا وشك بووم ...

ئازیزم دڵتەنگیت بەئەستۆی من ،بێزاریت لە نشێو بەرز و نزمی هەڵدێرەکانی ژیانت ماندووی نەکردویت، هەمیشە هەواڵی

بێدەنگیت دەپرسم ،خەمی قورسی مـن ، ئەوەیـە بێـداربیت و ،لـە شێوەی من کەسێ نەبێ نازی بێ ئۆقرەیت بکێشـێ ،شـەهرزادەکەم تەندروستیت چۆنە ..؟

هەمیشە پەتایی بێ تۆی یەخسـیری کـردوم ،هـەڵوەدام بە(با)یـەکی ئێوارانی تەمەنی کۆڵانەکانی تەنیایم دا هەواڵی تۆ و بۆنی پرچی تـۆ و تابلۆیەکی زەردەخەنەی تۆ و نیگای چاوەکاڵەکانی تۆم بۆبێنێـت (با) لـە فرمێسکەکانی تۆ بپرسم لـە ئێوارەی بێ تۆیدا...

بە (با)یەکدا نامەیەکت بۆ بنێرم باسـی ئازارەکـانم بکـات و کـەمێ لـەبۆنی هەناسەی تەزیوی تۆم بۆ بهـێنێ ،گەرچـی خـاوەن برینێکـی قوڵم بیر لـە تەنیایم بکەرەوە...!

# دامێنی شیعر



حەزم وایە
هێندەی دڵۆپی باران
بەیانیەك گوڵ بباریٚ
شەقامەکان داپۆشێت و
ڕێگا لە ڕێبوارەکان بگریٚ
نیگایی جوانی چاوکاڵەکان
ئاوێتەی شکۆفەبن و
کانی و بەرۆچکەی سەربانەکان
لێویان ،بە گوڵ تابلۆ بکریٚ

هەواڵ بگاتە کوچەکانی شار
بەتاسەوە پەیام بدرێ
ماڵتان بکەن بەمەنزڵ و
لەم هەوارە، مەچنە دەرێ
چونکە، وەرزی گوڵ بارانە
لەم شارەدا پەی پێ دەبرێ
با... جوانی شار بە گوڵەکان
لە ژێرپێدا، لە بار نەبرێ
لە پەنجەرەی نیگاکاندا تەماشاکەن
گوڵ دەبارێ گوڵ دەبارێ

وەلێ،لەدیدی خەمباری مندا
هەموو شتەکان چونەوە
ئەم ئێوارە لەلای ماڵمان
پاساری بۆ نێو هێلانە
پەپولە بۆ ڕەزی گوڵ و
ئەستێرە بۆ باوەشی ئاسمان
ئەم ئێوارە لەکۆڵانی تەنیایمدا
خۆریش بۆ ماڵی ئێوارە
بێداری وخەم بەڕوومەوە

لە کوچەو کۆڵانەکانی شار
دڵتەنگی بە وشەکانەوە دیارە
ئەوەی هەرگیز نەچویەوە
ماڵئاوایی نەکرد ،لام مایەوە
عشقی (شەهرەزاد) بوو
نە ئاوا بوو، لەشیعردا و نە لە بیریم چوویەوە...

POETRY

# THE WORLD OF SILENCE

MARIWAN QARADAXY

دەڕوانم خۆم لە مندا
سەرنجەکانم بوون بەدووان
ڕوانینەکانم ، بە دوو بەش
من لە ناخی شەهرەزاد دا
بێدەنگی پێناسەمەو هەڵوەرین ناونیشان و
مەزرا سوتاوەکانی دڵم نەخشەیەو
مەودایی بینینم لە ئەودا
وەك دەریایەکی بێ بن
لرفەی شەپۆلەکانم ناگاتە کەنار

As staring, i can see me inside myself
my attentions become two parts
as well as my views
from inside of Shahrazad
quiet is my definition, fading is my address.
the burned farm of my heart is a map,
and the distance of my sight in it,
like a deep sea
my waves can not get beach